# تێگەیشتن

# ڕۆژئاوا ـ ئیسلام

## بەریەککەوتن ، تێکەڵبوون ، یەکتربیناکردن


***عادل باخەوان***

خوێندکاری دوکتۆرا

قوتابخانەی خوێندنی باڵا لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان



پاریس

2006

- ناوی کتێب : ڕۆژئاوا ـ ئیسلام
- بابەت : لێکۆڵینەوە
- ناوی نووسەر : عادل باخەوان
- ساڵی چاپ : ٢٠٠٦
- نۆرەی چاپ : یەکەم
- ژمارەی سپاردن (٢٥٣)ی ساڵی ٢٠٠٦ ی دراوەتێ.
- تیراژ : ٢٠٠٠ دانە
- نرخ: ٢٥٠٠ دینار
- چاپو بڵاوکردنەوە: چاپخانەی ڕەنج.

# بەشی یەکەم

# ئەمەریکای ئوسامە/ ئوسامەی ئەمەریکا

## ١- سێپتەمبەر١٠٠٢.

١١ي سێپتەمبەر٢٠٠١، کام رۆژنامە هەبوو کە لەرۆژی دووهەمدا یەکەم لاپەرەی بۆ ئەو ناونیشانە تەرخاننەکردبێت؟ ئێمە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە راستەوخۆ دەمانبینی چۆن هەردوو بورجی سەنتەری بازرگانیی ئاگریان تێبەردەبێت و قات قات بەسەر یەکدا دادەرمێن و وردوخاشدەبن. وێنەی تەلەفزیۆنەکان و وشەی رۆژنامەکان، بینەرو خوێنەریان تووشی شۆک دەکرد. ئایا گێرانەوەی ئەم چیرۆکە و نمایشکردنی وردوخاشبوونی هەردوو بورج، وەک هێمای هەیمەنەی کەپیتالیسمی ئەمەریکی بەسەر دونیادا و بەردەوام ناوخوێندنەوەی ئەو دوو هەزارو حەوسەدو چل و نۆ کەسەی لەو کارەساتەدا گیانیان لەدەستدا، بۆ ئێمە چ مانایەکی هەیە؟ و بۆچی ئێمە ئەو رووداوە ناو دەنێین ١١ي سێپتەمبەر؟ جاک دێریدا لەوەلامدا دەڵێت:

"ناونانی ئەم رووداوە بەمشێوەیە چ مەدلولێکی هەیە، لەکاتێکدا جێگای رووداوەکەو رووداوەکانیشی لەدەرەوەی گوزارشتلێکردن دەمێننەوە؟ ئەم ناونانە گەر مەدلولێکی هەبێت، دەبێت بریتیبێت لە وەی

**کە لەدەرەوەی خاکێکی دیاریکراوداو لەدەرەوەی کارەساتێکی دیاریکراودا، خۆی مانیفێستدەکات"[1]**

لەو رۆژە بەدواوەو لەدوای ئەوەی کە هەموومان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە وێنەی ئەو مرۆڤەمان بینی کە لە پەنجەرەی بورجەکەوە خۆی فرێدایە خوارەوە و دڵنیاشبوو لەوەی کە دەمرێت، ئیتر بەپێی سەرۆکی ئەمەریکا، شەو بەسەر جیهانێکی جیاوازدا داهات. ساڵێک دوای رووداوەکە، زۆربەی رۆژنامەکان وێنەی بن لادن و وێنەی ئەو مرۆڤەیان لەپەنای یەکتردا بڵاوکردەوە، بۆنموونە رۆژنامەی Le Monde*ی فەرەنسی لەخوار ئەو دوو وێنەیەوە نوسیبووی : سێبەری بن لادن بەسەر جیهاندا.*

لەرێگای رۆژنامە و تەلەفزیۆنەکانەوە، ئیتر هەستمان بەوەکرد کە هەموو شتێک ئامادەیە بۆ ئەوەی لەو رووداوە شتێکی وەک دابران لەگەڵ دونیای پێشوودا بینابکرێت. واتە ئیتر ١١ي سێپتەمبەری٢٠٠١ بەتەنها رووداوێکی جەرگبرنییە، بەتەنها هاواری دایکە کور مردووەکان و منداڵە هەتیوەکان و وردوخاشبوونی دوو بورج نییە، بەڵکو دابرانێکی مێژووییشە.

## *٢- دابرانی مێژوویی !*

ئایا بەراستیی ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١، دەکرێت وەک دابرانی مێژوویی تەماشابکرێت ؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، دوو زانای ناسراو لەسەر ئاستی جیهان بەدەنگ دێن. یەکەمیان **ئالان تۆرێنی** سۆسیۆلۆگە، کە لە دواهەمین کتێبیدا بەناوی "**پارادیگمێکی نوێ**" ، دێت و یەکەم بەشی ئەو کتێبە نایابەی بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو پرسیارە

ڕخاندەکات. زانای دووهەمیش ڕۆنی ڕیمۆندی مێژوونووسە، کە لە
ڕا کتێبیدا بەناوی " **لە دیواری بەرلینەوە بۆ بورجەکانی نیۆیۆرک** "
ەردوو ڕووداو بەراوردەکات. با لە تۆرێنەوە دەستپێبکەین.
ئالان تۆرێن پێیوایە کە لەپاش هەرەسی ئیمپراتۆریەتی
ۆمۆنیستەوە تا ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١، ئێمە باسمان لە کۆمەڵگەی
ەدەنیی و لاوازبوونی نۆرمەکان و ئازادیی تاکەکان دەکرد. بەڵام لە
١ي سێپتەمبەري٢٠٠١ ەوە، کۆمەڵگەکان و تەنانەت هەرە
وڵەمەندەکانیش لەنێو ترس و زەبروزەنگ و جەنگێکی بەردەوامدا
ەژین. لەپاش ئەو ڕووداوەوە، کەمنین ئەو کەسانەی کە پێیانوایە ئیتر
ەبێت گوێ لە گوللەی فیشەکەکان بگرین نەک لە گۆرانییەکانی لارا
بیان، ئیتر دەبێت زمانی CIA بەکاربێنین نەک زمانی
یلەسوفەکان. تۆرێن دەڵێت:

> **" ئەم ترسە بەردەوامە، ئەم هەرەشە کوشندەیەی بەرێوەیە، هەروەها خواستی جەنگ دژی خراپە بەناوی خوایەکی پارێزەرەوە، داهێنان و مۆتەکەی ئەمەریکی نییە. دروستکراوی خەیاڵی ئەمەریکییەکان نییە. بەڵکو واقیعێکە. ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١ بریتییە لەو ڕووداوەی کە لە نیویۆرک و واشنتۆن ڕوویداوە. ڕووداوێک کە لەدەرەوە دێت و ناوەوە دەپێکێت."[٢٠]**

تۆرێن پێیوایە کە ئەم گەردوونە نوێیەی ترس و زەبروزەنگ
ەرهەمی دوو شکستە، شکستی بەمۆدێرنکردنی بەشێکی گەورەی
جیهان لەلایەک و شکستی ئیسلامی سیاسیی لە دروستکردنی
وڵەتدا لەلایەکیدیکەوە. دەرەنجام کۆمەڵگەکان، تەنانەت لە ئەورووپاو

ئەمەریکاش، هەڵدەوەشێنەوەو لەت لەت دەبن. گەر **گوزەر** لە "کۆمینۆتی"وە بەرەو "کۆمەڵگە"، یەکێک بێت لە دەستکەوتەکانی مۆدێرنیتی، ئەوا گەرانەوە لە "کۆمەڵگە"وە بەرەو "کۆمینۆتی"، یەکێکە لە دیاردە هەستپێکراوەکانی دونیای ئەمرۆمان. بەڵام ئایا بەراستیی ئێمە لەبەرامبەر بزوتنەوەیەکي لەم جۆرەداین؛ بزوتنەوەی گەرانەوە بۆ کۆمینۆتیی **داخراو لەسەر خۆ، رەتکەرەوەی دەرەوە، ئەوانیتر وەک دوژمن تەماشاکردن**؟ تورێن پێماندەڵێت "بەڵێ"، بەڵام لەبەرامبەر ئەو داکشانەدا بیناکردنێکی دیکەش بەرێوەیە، بیناکردنی خود. دیارە تورێن بیناکردنی **خود** لە بیناکردنی **تاک** جودادەکاتەوە. ئەو پێیوایە سەرهەڵدانی بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی وەک فێمینیسم و هۆمۆسێکسیوالیتی و هەرەسی چەمکی چینی کرێکاریی و هەڵوەشانەوەی پەیوەندییە خێزانییەکان و گەرانەوە بۆ **سێکت** « secte »و ئاینەکان و خۆپیشاندانی ملیۆنانەی دژە-گلۆبالیزاسیۆن ... دەرۆنە نێو ئەو چوارچێوەیەوە کە ناوی دەنێت بیناکردنی خود.

> **" لە کۆمەڵگەی ئەمرۆدا، ئێمە چاودێریی دوو هێز دەکەین. هێزێک کە کار لەسەر هەڵوەشانەوەو رووخاندن و شکاندنی ئەکتەری کۆمەڵایەتیی دەکات. هێزێکی دیکەش کە کار لەسەر بەرگرییکردن لە ئازادیی دەکات. هێزی دووهەم بریتییە لە هەموو ئەو بزوتنەوە کۆمەڵایەتییانەی کە رەنگدانەوەی "خود"ن و کار بۆ بیناکردن و پاراستنی "خود" دەکەن."**[30]

لەسەر هەمان رەوت، بەڵام بەئاراستەیەکی دیکەدا، رۆنی رێمۆند هەرەسی دیواری بەرلین و دارمانی هەردوو بورجی سەنتەری

بازرگانیی نێودەوڵەتیی بەیەک بەراوردەکات، تا پێمانبڵێت ١١ي سێپتەمبەري ٢٠٠١، واتە: چوونە نێو قۆناغێکی دیکەی مێژووییەوە، کە تیایدا گرەوو یاساو ستراتیژیەتەکان بەجۆرێکی دیکەن. ئەو دەڵێت:

"ئێمە لەبەردەم دوو رووداوداین، هەرەسی دیواری بەرلین و هەرەسی هەردوو بورجەکەی سەنتەری بازرگانیی نیۆیۆرک. من پێموایە رووداوی یەکەم دەکرێت وەک درەوشانەوەی دەسەڵات و توانایی رای گشتیی تەماشابکرێت، رای گشتییەک کە ئامادەنییە سازش لەسەر ئازادیی بکات و ئامادەیە لەگەڵ بەربەریەتدا رووبەرووببێتەوە. رووداوی دووهەمیش ئەوەمان بۆ دووپاتدەکاتەوە کە تیرۆریسم بەشێکە لە مێژووی هاوچەرخمان و لکاوە بەکۆمەڵگەکانمانەوە. رژێمە دیمۆکراتەکانیش هیچ گەرەنتییەکی سەدلەسەدیان پێنییە بۆ پاراستنی کۆمەڵگەکان و شارستانیەت لە هێرشە تیرۆریستییەکان."[٤٠]

دوای ئەوەی کە لیبرالیسم شکستی بە ئیمپراتۆریەتی کۆمۆنیست هێنا، فرنسیس فۆکۆیاما هات و کۆتایی مێژووی راگەیاند. ئەو پێیوابوو کە ئیتر لیبرالیسم دوژمنی نەماوەو ململانێکان کۆتاییان پێهاتووەو تر تەنها ئیختیارێک هەبێت بریتییە لە رازیبوون وناواندن و بەرسکردنی هەیمەنەی لیبرالیسم°. بەڵام دونیای پاش ١١ي سێپتەمبەري ٢٠٠١، شکست و کورتبینیی وهەڵوەشانەوەیەکی ئاشکرای تیۆریی "کۆتایی مێژوو"یی ناوبراون.

لەهەمانکاتدا خوێندنەوەیەکی دیکە دەیەوێت بەئاراستەیەکی دیکەدا ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١، وەک دەرهاویشتەیەک تەحلیلبکات. ئەو توێژەرانەی کە لەپشت ئەم خوێندنەوەیەوەن، پێیانوایە کە ١١ي سێپتەمبەر بەمانای **درێژبوونەوەی** مێژوویەکە نەک **دابران**، چونکە ئەوە یەکەم تەقینەوەو دواهەمین تەقینەوە نییە، کە دژ بە ئەمەریکا کرابێت. تەنانەت هەمان سەنتەری بازرگانیی، لە ساڵی 1993داو لەلایەن تیرۆریسمی ئیسلامییەوە هێرشی کرایەسەرو دەرەنجام شەش کەسی تیادا کوژران. لە پەلاماردانی سەفارەتی ئەمەریکادا لە لوبنان، لە 1983وە تا ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١، پانزە هێرشی جەرگبرو بکوژ کراوەتە سەر ئەمەریکاو بەرژەوەندییەکانی لە دونیادا و هەموو ئەو هێرشانەش تەنها تیرۆریسمی ئیسلامیی، بەهەموو باڵە جوداکانیەوە، ئەنجامیداوە.

گەران بەداوی ئەو تاڵە دەزووەی کە بەشێکی زۆری ئەم رووداوانە بەیەکەوە دەبەستێتەوە، کارێکی ئاسان نییە. و من پێموایە هەر تەحلیلێک بە ئاڵۆزیی پەیوەندییەکان و تێکەڵبوونی ستراتیژێتەکان و لەیەکئالانی بەرژەوەندییەکاندا نەچێتەخوارەوە، دواتر ناتوانێت شتێکی گرنگمان پێبڵێت. ئێمە دەبێت ئیمان بێنین بەوەی کە دونیای کۆمەڵایەتیی ( کە هەموو دونیاکانی دیکە لەخۆدەگرێت)، **سادەنییە و ئاڵۆزە**. ئەم ئیمانە ناچارماندەکات بەوەی کە لەبەرهەمهێنانی (سادە-سادەکاریی-سادەکردن-سادەبوون-سادەکردنەوە) دووربکەوینەوە. لێرەوە دەڵێم، گەران بەدوای ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١دا، دەمانباتەوە سەر " مێژوویەکی نهێنیی " کە رەنگە یەکێکبێت لە شتە هەرە ئاڵۆزەکانی سەردەمی نوێمان. سەرەتا دەبێت بڵێین، ئەم مێژووە نهێنییە، بەپێی گۆڕانی ئەوانەی کە لە " کۆشکی سپی"دا فەرمانرەوان دەگۆڕێت، واتە یەکێک لە سیفەتەکانی ئەم مێژووە ئەوەیە کە " جێگیر" نییە.

لەساڵی 1976داو بەپێی بریاری حوشکی سپی ، CIA ڕێککەوتنێک لەگەڵ موخابەراتی ئێرانی و سعودی ومیسری و مەغریبیدا ئیمزادەکات. ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە ڕێگابگرن لە یەکێتی سۆڤێت، بۆ ئەوەی نەتوانێت بەرەو ئاسیا و ئەفەریقا بکشێت. CIA داوا لەموخابەراتی ئەم دەوڵەتانە دەکات، بۆ ڕێگرتن لە یەکێتی سۆڤێت، هەموو تەوژمە کۆمەلایەتیی و سیاسییەکان مۆبیلیزە بکەن. لێرەوە بزووتنەوە ئیسلامییەکان، وەک یەکێک لە ئەکتەرە سەرەکییەکانی ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیە، دێنە مەیدان و سەرئاو دەکەون. بەتایبەتی هەردوو حکومەتی پاکستانی و عەرەبی سعودی، هەموو دەرگاکانیان دەخەنە سەرپشت بۆ بزووتنەوە ئیسلامییەکان.

پاش هاتنی ئایەتوڵلا خومەینی و دروستکردنی جمهوریەتی ئیسلامیی لە ئێراندا و ڕاگەیاندنی جەنگی سامبۆلیک لەگەڵ ئەمەریکادا، ئیتر CIA بۆ ڕێگرتن لەلایەک لە ئیسلامی شیعە و لەلایەکی دیکە لە یەکێتی سۆڤێت، بریاری هاوکارییکردن ویارمەتیدان و کاربۆئاسانکردن پشتیوانییکردنی ئیسلامی سوونی دا. تەنانەت دەرگاکانی واشنتۆن و نیۆیۆرک هەمیشە کراوەبوون بۆ عەبدوڵلا عەزام و حیکمەتیارو عومەر عەبدولرەحمان و هەزارانی دیکەش. CIA، ئیسلامی سوونی بەکاردەهێنا لەیەککاتدا بۆلێدانی یەکێتی سۆڤێت و ئیسلامی شیعە و ناسیۆنالیسمی عەرەبی دژ بەئەمەریکا. بەڵام دواتر ئەم هاوکێشەیە، بەتایبەتی لە عێراقی پۆست-سەدام دا، دەگۆڕێت. لە عێراقی نوێدا، ئەمەریکا، نەک هەر دژی ئیسلامی شیعە نییە، بەڵکو پشتگیرییشی لێدەکات دژ بە ئیسلامی سوونی. واتە ئیتر لە عێراقدا، ئەو کارتەی کە کۆشکی سپی یاری پێدەکات زۆرینەی شیعەیە، کە دەکرێت بتوانن باشتر بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا بپارێزن. لێرەدا تێدەگەین لەوەی کە هەر گرەوکردنێک لەسەر تێکەڵکردنی ئەخلاق و سیاسەت، دەرنجامەکەی دۆڕانێکی گەورەیە.

لەهەردوو جەنگی کەنداودا، ئەمەریکا ناچارە عەرەبی سعودی وەک هاوپەیمان بپارێزێت. لەبەرئەوەنا کە سعودییەکان باشن یان خراپ، بەڵکو لەبەرئەوەی کە پەیوەندییە بازرگانییەکانی نێوان هەردوو خانەوادەی سەرۆک جۆرج بوش. و خانەوادەی پاشانشینی سعودیە وەک زریسک لەیەکتری ئاڵاون و لێکجیاکردنەوەیان زۆر ئەستەمە. تەنانەت بەشێکی گەورەی خانەوادەی ئوسامە بن لادنیش لەو بازرگانییە ئاڵاوە. جێمس شلیسنگەر، بەرپرسی پێشووی CIA، راستگۆیانە باس لە پەیوەندیی نێوان ئەمەریکا و عەرەبی سعودی دەکات:

**"ئایا هەر بەجدیی ئێمە دەمانەوێت دەزگاکانی عەرەبی سعودی بگۆڕین؟ راشکاوانە پێتاندەڵێم: نەخێر. چەندین ساڵە ئێمە بەدەستی خۆمان ئەو دەزگایانەمان دروستکردووە. تەنانەت هەندێکجار دژ بەدیمۆکراسیش بەکارمانهێناون."[٦٠]**

ساڵی رابردوو، توێژەری فەرەنسی جۆنەتان راندال کتێبێکی بڵاوکردەوە بەناوی (ئوسامە. دروستکردنی تیرۆریستێک). لەو کتێبەدا توێژەر هەموو ئەو بلۆک و خشتانە، یەک یەک دەخاتەروو، کە ئەمەریکا و عەرەبی سعودی، لە مێژوویەکی نزیکدا، خانووی تیرۆریسمی بن لادن و ئەلقاعیدەیان پێدروستکرد. و بە سەدان بەڵگەی پشتئەستوور بە زانیارییەوە، پێماندەڵێت کە ئوسامە بەمشێوەیە لەدایک نەدەبوو، گەر ئەو دوو وڵاتەی لە پشتەوە نەبوایە[٧].

با ئێستا ئێمەش بەشێک لەو زانیارییانە فەحسبکەین :

ئوسامە، ساڵی 1957 لەدایکدەبێت. کوری یەکێک لە هەرە دەوڵەمەندەکانی عەرەبی سعودیە. ئەم پیاوە دواتر بە میرات، سەروەت وسامانێکی گەورە و بەرفراوانی بۆ دەمێنێتەوەو دەکەوێت

ەسەر هەزاران هەزار ملیۆن دۆلاردا. ساڵی 1980، ئەرکی چەک
ەیاندنە موجاهیدەکانی ئەفغانستان دەگرێتە ئەستۆ. لەم چرکەیەوە،
ەواجی بن لادن و ئەمەریکا-سعودیە دەستپێدەکات و پێکەوە دەچنە
انگی هەنگوینییەوە. دیارە ئامانجی هەرەگەورەی ئەمەریکا، لەو
ناغەدا، شکستی یەکێتی سۆڤێت بوو. بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش،
امادەبوو دەست بخاتە نێو دەستی شەیتانەوە. واتە، بەقەدەر
ەوەندەی ئوسامە پێویستی بە چەکی ئەمەریکی هەبوو، بۆ برا
جاهیدەکانی ئەفغانستان، بەهەمان قەدەر ئەمەریکاش پێویستی بە
ن لادنەکان هەبوو، بۆ بردنەوەی جەنگی سارد و گەرمی دژ بە
ۆڤێت. ئیتر بن لادن و ئەمەریکا دەرۆنە نێو ئەوەی ناوی دەنێم:
رۆسەی یەکتر دەروستکردن و یەکتربیناکردنەوە).
ێرەدا من لە جۆنەتان راندال جودادەبمەوە. چونکە ئەو پێیوایە کە
تەنها بن لادن دروستکراوی ئەمەریکایە. بەڵام من پێموایە هەر لە
انگی هەنگوینییەوە، هەردووکیان لەبیناکردنی یەکتریدا بوون.
مەریکا ئوسامەی بینادەکرد و ئوسامەش ئەمەریکای بینادەکرد. لەو
الانەدا، دەرگای هەموو ئەو کارگانەی کە چەکیان دروستدەکرد لە
مەریکا، لەسەر پشتبوون بۆ ئوسامە. دواتر بەوەشەوە ناوەستێت و
ژی سەفەردەکات بۆ ئەفغانستان و لەوێ گروپێک لە موجاهیدین
کدەهێنێت و لە 1987دا راستەوخۆ بەشداریي جەنگ دەکات.
پاش تەواوبوونی جەنگ و شکست وهەڵوەشانەوەی یەکێتی
ۆڤێت، ئیتر وردەوردە پەیوەندیی نێوان بن لادن و ئەمەریکا
ڵدەبێتەوەو پاشان گرژدەبێت و دواتر دەبێت بە پەیوەندیی دوژمن
دوژمنەوە. لە لوتکەی هاوڕێیەتییەوە بۆ لوتکەی دوژمنایەتیی.
فتی ئەم دوو دووژمنە نوێیە، ئەوەیە کە یەکتری باش دەناسن و
زانن چۆن ئازار بە یەکتری دەگەیەنن. لە ساڵی 1993دا بن لادن
گەزنامەی سعودی لێدەسەنرێتەوەو لەلایەن ئەمەریکاوەو

بەشێوەیەکی ڕەسمیی وەک تیرۆریست لەقەڵەمدەدرێت ودەناسێنرێت. هەر لەهەمان ساڵداو لە سودانی تورابیەوە بەرەو جیهان، ئوسامە تۆرەکانی پەیوەندیی ئابووریی و تەنزیمیی دادەمەزرێنێت. ساڵی 1996 سودان بەیەکجاریی بەجێدێڵێت و ڕوودەکاتە ئەفغانستان. لە 07.08. 1996 داو بەشێوەیەکی ڕەسمیی بن لادن جیهاد لەدژی وڵاتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا ڕادەگەیەنێت. لە 1998 .23.02دا ئوسامە داوا لە موجاهیدەکانی دەکات کە لەهەرکوێیەکی دونیادا بۆیاندەکرێت دەست لە ئەمەریکا وبەرژەوەندییەکانی بووەشێنن. بۆ بەدەنگەوەچوونی ئەم داوایە، لە 07.08.1998دا، هەردوو سەفارەتی ئەمەریکا لە نەیرۆبی و دار السلام، وەک میزەڵان تەقێنرانەوە. تەنها جیاوازییەک لەنێوان تەقاندنی میزەڵان و ئەو دوو سەفارەتەدا، ئەوەیە کە تەقاندنی میزەڵان کەس ناکوژێت ، بەڵام لەو دوو تەقینەوەیەدا 224 کەس گیانیان لەدەستدا.

پاش ئەو هێرشانە، ئەمەریکای بیل کلینتۆن، بەتوندیی هەست بە برینەکانی دەکات و بە بەرچاوی هەموو دونیاوە دەبینێت چۆن خوێن بەناوگەڵیدا دەچۆرێت. بۆیەکەمجار، ئیدارەی کلینتۆن، لە ساڵی 1999دا، پێنج ملیۆن دۆلار تەرخاندەکات بۆ سەری بن لادن. دواتر، نرخی سەری بن لادن بەرزدەبێتەوە تا دەگاتە بیست و پێنج ملیۆن دۆلار، بێگومان پاش ڕووداوی ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١ .

بن لادن دەیویست و دەیەوێت ئەمەریکا بکات بە مۆتەکەی سەرسنگی خودی ئەمەریکییەکان. دەیەوێت تارمایی ئەلقاعیدە لە پێش هەموو ئەمەریکییەکەوە ڕێبکات. ئەم ئامانجە، هەر لە سەرەتای دروستکردنی (**بەرەی ئیسلامیی جیهانیی بۆ جیهادکردن دژ بە جولەکە و سەلیبییەکان**) لە 1998دا، دەردەکەوێت:

**"زیاتر لە حەوت ساڵە ئەمەریکییەکان، نیوە دورگەی عەرەبیان، کە پیرۆزترین خاکی**

ئیسلامە، داگیرکردووە. ئەمەریکییەکان سامانمان دەدزن و خواستی خۆیان فەرزدەکەن بەسەر دەسەلاتدارەکانی ناوچەکەدا و موسوڵمانان بێحورمەتدەکەن و هەرەشە لە وڵاتانی دراوسێ دەکەن و بنکەکانیان لە نیوە دورگەی عەرەبیدا، بۆ لێدانی موسوڵمانان بەکاردەهێنن... ئێمە دەزانین کە لە پشت ئەو جەنگەوە، ئەمەریکا ئامانجی ئاینیی و ئابووریی هەیە، بەلام لەهەمانکاتدا بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی جولەکەشە ."[80]

پاش نومایشکردنی ئەم چەند دیمەنە، هەریەکێک لە ئێمە دەتوانێت تێبینی ئەوەبکات کە چۆن بن لادن لکاوە بە مێژووی سیاسیی ئەمەریکاوە، و چۆن مێژووی سیاسیی ئەمەریکا لکاوە بە بن لادنەوە. بێگومان مەبەستمان لە مێژووی تەواو نزیکە.

لەهەمانکاتدا دەبێت ئەوەمان لەبیرنەچێت کە ئەو فەوزایەی رۆژهەلاتی ناوەراستی گرتووەتەوە، بەشێوەیەکی راستەوخۆ، بەشدارە لە دروستکردنی "ئەمەریکا-ئوسامە"دا. واتە ئەوەی ناوی دەنێم "ئەمەریکا-ئوسامە"، هەرگیز بەمشێوەیە نەدەبوو، گەر ئەو فەوزایە کە ئێستا پێترۆل و دەوڵەتی نەتەوەو ململانێی ئیسرائیل-فەلەستین و عێراق و ئەفغانستان و ئێران و پاکستانی داپۆشیوە، بەشێوەیەکی دیکە بوایە. ناکرێت قسە لە ئەمەریکا-ئوسامە بکرێت بەبێ بەشدارییکردنی هەموو ئەو رەگەزانەی کە کۆی ئەو بوونیەیە دروستدەکەن.

ئایا بەراستیی ئەمەریکا دەیەوێت رۆژهەلاتی ناوەراست جێگیر و پێشکەوتوو و دیمۆکراتبێت؟ وەلامی ئەم پرسیارە ئاسان نییە.

بەتایبەتی لە پاش ١١ی سێپتەمبەری٢٠٠١ەوە. ئاسانە بڵێین بەڵێ. ئاسانە باوەر بە لێدوانەکانی سەر تەلەفزیۆن بکەین. بەڵام ئایا ئەوەی لەسەر مەیدان روودەدات، ئەوەی لەسەر ئاستی کردار ئەمەریکا دەیکات، دەمانگەیەنێتە ئەو ئاستەی کە باوەر بە بەڵێ بێنین؟ من وەک کەسێک کە لە رۆژهەڵاتی ناوەراست لەدایکبووم و دەیان پەیوەندیی بەو ناوچەیەوە دەمبەستێتەوە، دەمەوێت لەوپەری قوڵایی دڵمەوە باوەر بە "بەڵێ" بێنم. بەڵام بەداخەوە دەرهاویشتەکان وانالێن. رووداوەکان وانالێن. تێبینیکردنی ئەمەریکا، لەسەر ئاستی کردار، بەئاراستەیەکی دیکەدا توێژینەوەکانمان دەبەن. ئێمە دەتوانین لەگەڵ ئالان ژۆکسدا، سیاسەتی ئەمەریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا، لەم گوزارشتەدا کۆبکەینەوە : **ئیمپراتۆریەتی فەوزا**. راستە کە ئەمەریکا سەرگەرمی دامەزراندنەوەو بیناکردنەوەی رۆژهەڵاتی ناوەراستە. بەڵام ئەوەش راستە کە ئەو بیناکردنەوەو دامەزراندنەوەیە، ئیمپراتۆریەتێکە لە فەوزا. هەر لە عێراقەوە بیگرە تادەگاتە ئەفغانستان و فەلەستین و پاکستان و هتد. ئەو سیاسەتەی کە ئێستا پیادەدەکرێت، بریتییە لە سیاسەتی: ئیدارەکردنی فەوزا. ئالان ژۆکس لە هەمان سیاقدا دەنووسێت:

**" ئەمەریکییەکان هەموو جیهان وەک فەوزا دەبینن و پێیانوایە ، لەنێو ئەو فەوزایەدا، ئەرکی سەرشانیانە کە رێنمایی رەفتاری ریزپەرەکان بکەن و وانەکانی چۆنیەتی مانەوەیان پێبڵێنەوە"**[٩٠]

لەنێو ئەم ئیمپراتۆریەتی فەوزایەدا، دوو دیاردە جێگای تێرامان و وردبوونەوەو تەحلیلکردنن . یەکەمیان گەشەکردن و گەورەبوون و بەهێزبوونی ئەمەریکایە و دووهەمیشیان گەشەکردن و گەورەبوون و بەهێزبوونی تیرۆریسمی ئیسلامییە! ئالان تۆرێن دەڵێت: وەک چۆن

ئەمەریکا دەستی دەگات بەهەموو دونیاو لەهەر جێگایەکدا ویستی دەتوانێت دەستبووەشێنێت، تیرۆریسمی ئیسلامییش بەهەمانشێوە دەتوانێت لەهەر جێگایەکی ئەم دونیایەدا، دەستبووەشێنێت و پەلاماربدات. لێرەدا راستەوخۆ هەر تویژەرێک دەکرێت لەخۆی بپرسێت: ئەو پەیوەندییە سیحراوییە چییە لەنێوان گەورەبوونی ئەمەریکا و گەورەبوونی تیرۆریسمی ئیسلامییدا؟ بۆ ئەم دووانە بەیەکەوە گەشەدەکەن؟ تەماشای ئەم پەیوەندییە بەرامبەرگەرایە: کە ئوسامە پەلاماری نیۆیۆرک و واشنتۆن دەدات، ئەمەریکاش پەلاماری ئەفغانستان و عێراق دەدات! ئەم کۆدانە چۆن دەکرێنەوە؟

یەکێک لە گرفتە هەرەسەرەکییەکانی ئەمەریکا، بریتییە لەوەی کە جیهانی ئیسلام، وەک ئەمەریکا، لە ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١ ناڕوانن و ئامادەنین بەو مانایانە رازیبن کە رۆژئاوا بەگشتیی و ئەمەریکا بەتایبەتی بەو رووداوە مێژووییەی دەبەخشن. بەپێچەوانەوە، رامان و بینینی ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١ لە جیهانی ئیسلامدا، سەدو هەشتا پلە جیاوازە لە رامان وبینی رۆژئاوا. موسوڵمانان پێیانوایە کە هێرشەکانی ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١، دیمەنێکە لەدیمەنەکانی ئەو شانۆگەرییەی کە زیاتر لە نیو سەدەیە بەردەوامە. ئەو هێرشانەش ناکرێت وەک رووداوێک لە دەرەوەی رووداوەکانی دونیای ئیسلام تەماشابکرێت. ئەفغانستان، عێراق، پشتیوانییکردنی بێسنوری ئیسرائیل، هێرشکردنە سەر لیبیا، دەستخستنە کاروباری لوبنان، سۆمال، پاکستانەوە، دروستکردنی بنکە لە سعودیە، یارمەتیدانی بێسنوری رژێمە دیکتاتۆرەکانی دونیای ئیسلام... لیستەکە دەکرێت سەد ئەوەندە درێژبکرێتەوە. ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١، لەنێو جەرگەی هەموو ئەم رووداوانەوە دێتەدەرەوە. پاش هێرشەکانی ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١، ئەلقاعیدە، لە دیسەمبەری هەمان ساڵداو لە بەیانەکانیدا باس لەو هێرشانە دەکات، وەکئەوەی وەڵامدانەوەیەک بن

بە هەڵوێستی ئەمەریکا لەسەر دونیای ئیسلام بەگشتیی و فەلەستین بەتایبەتی.
ئەم جەنگە راگەیانراوو بەردەوامەی نێوان هەردوولا، دیارە زەمینەیەکی بەهێزی هەیە و لە بۆشاییەوە نەهاتووەتە دەرەوە. کۆمینۆتێی توێژەرانی مەیدانی تێرۆریسم، بەوردیی لە فەحسکردنی ئەم دیاردەیەی خوارەوەدان:
(بەرزبوونەوەو گەشەکردن و دەسەڵات پەیداکردنی دوو بەرە لەیەک کاتدا: بەرەی کۆنسێرڤاتۆرە نوێیەکانی (موحافیزە نوێیەکانی) کۆشکی سپی و بەرەی ئیسلامیسمی رادیکاڵیی نێو رابوونی ئیسلامیی). لەکاتێکدا کە بن لادن و فۆندامۆنتالیسمی نوێی ئیسلامیی، لە پرۆژە ئەسڵییەکەی ئیسلامی سیاسیی جوادەبێتەوەو لەو گەردوونە دێتە دەرەو کەرەسەو مەنهەج و بیرکردنەوەی بە ئاراستەیەکی تەواو رادیکالانەدا دەبات و دەیەوێت لەرێگای زەبروزەنگەوە دونیا دابرێژێتەوە، لەهەمانکاتدا کۆنسێرڤاتۆرە نوێیەکانیش دەگەنە کۆشکی سپی و بەرنامەکانی پێشوو لە ئەرشیفدا خەزندەکەن و بە بەرنامەیەکی نوێوە، هەوڵی کۆنترۆڵکردنی دونیا دەدەن. ئەم بەرنامەیەشیان سەرەتا بە کۆنترۆڵکردنی سەرچاوەکانی پترۆل و هاوکاریی بێسنوری ئیسرائیل دەستپێدەکات. بۆ کۆنترۆلکردنی پترۆل، هەنگاوی یەکەم دەبێت لە لابردنی سەددام حوسەینەوە دەستپێبکات. و بۆ هاوکارییکردنی بێسنوری ئیسرائیلیش هەنگاوی یەکەم دەبێت کۆتاییهێنان بە یاسر عەرەفات بێت. هەروەها ئەو پەیوەندییەی کە لەگەڵ رژێمێکی لەرزۆکی وەک خانەوادەی پاشانشینی عەرەبی سعودیەدا هەیە، دەبێت سەرلەنوێ دابرێژرێتەوەو دونیای ئیسلامییش دەبێت بریاری چوونە نێو پرۆسەی خۆ-بەدیموکراتییکردنەوە، لەسەر تەریقەتی کۆنسێرڤاتۆرە نوێیەکانی کۆشکی سپی، بدات. لێرەدا پرسیارێ رووبەرووی ئێمە دەبێتەوە

رسیارێکی تەواو گرنگ لەسەر ڕێگای تێگەشتنمان لە و دونیا نوێیەی
ە چوار دەوری تەنیوین:

**سەرۆک جۆرج بوش لەکوێی ئەم هاوکێشەیەدایە؟**

لە هەڵبژاردنیەوە تا ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١، سەرۆک بوش زیاتر
ەک حەکیمێکی ناوبژیوانبوو. ئەو لەیەککاتدا گوێی لە کۆنسێرڤاتۆرە
ڕێیەکان و میانرەوەکان دەگرت. لەیەککاتدا گوێی لە پنتاگۆنی
ەندرەوەکان و وەزارەتی دەرەوەی میانرەوەکان دەگرت. سەرۆک، تا
١ي سێپتەمبەري٢٠٠١ ئەو پیاوەبوو کە دەرەوەی وەک پێویست
ەدەناسی. ئەو سەرۆکە بوو کە کەمترین وڵاتی دونیای بینیبوو.
ەمترین سەفەری بۆدەرەوە کردبوو. ئەو بە پێچەوانەی بیل
لینتۆنەوە، هەموو تواناکانی خۆی بۆ کاروباری ناوخۆ
ەرخاندەکردو کاروباری دەرەوەی بە کۆلین پاوەلی میانرەوو CIA
سپاردبوو. سەرۆک لەبەرامبەر کێشە جیهانییەکاندا، زیاتر لە
**ەماشاکارێکی نابەشدار دەچوو.** تەنانەت کە فرۆکەکانی ئیسلامی
ادیکاڵ پەلاماری بورجەکانی نیۆیۆرک و پنتاگۆنیاندا، ئەو لە نێو
ەوزەیەکدا و لەسەر کورسییەکی ئاسایی و بەرامبەر پۆلێک لە
ندالانی ئەمەریکی دانیشتبوو. ئەو بە خەندەیەکی هێمنانەوە گوێی لەو
ندالانە گرتبوو. ڕەنگە لەوکاتەشدا تەنها لەخەیاڵی منداڵیی خۆی و
اوتوێکردنی یادگارییەکانیدا بووبێت. لەو چرکانەدا فرۆکەکانی
سلامی رادیکال و پیاوەکانی بن لادن، پەلاماری ئەمەریکا دەدەن و
١ي سێپتەمبەري٢٠٠١ دروستدەکەن. لەم چرکەیەوە ئیتر سەرۆک
ش، بەگۆشت و ئێسقانەوە، خۆی فرێدەداتە باوەشی کۆنسێرڤاتۆرە
ێیەکانی کۆشکی سپییەوە. ئیتر بۆیەکەمجار دەنگی حیکمەتەکانی
ۆلین پاوەل کزدەبێت و دواتر وەک گلۆپێک لە کۆشکی سپیدا
تەواویی دەکوژێتەوە.

سەرۆک خۆی لەبەرامبەر ڕووداوێکی تەواو نوێ و ناوازە لە مێژووی ئەمەریکادا دەبینێتەوە. ناوازەیی ئەو ڕووداوە لەوەدایە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەرگیز بەوشێوەیە هێرشی نەکراوەتەسەرو هەرگیز بەوشێوەیە بریندار نەکراوە. هەروەها سەرۆک بوش خۆی لەبەرامبەر ناوازەیی گروپێکی تێرۆریستدا دەبینێتەوە. گروپێکی جیهانیی لەنێو دڵی گلۆبالیزاسیۆندا. گروپێکی تەواو مۆدێرنی خاوەن چەک، کە لە هەر چوار بەشەکەی دونیادا ئامادەی گورز وەشاندنە. ئاخر خۆ بن لادن کرێکارێکی هەژاری گەرەکەکانی شێخ عەباس و خەباتی سلێمانی نییە. بن لادن کوڕی خانەوادە کرێکارەکانی فەرەنسا و بەریتانیا نییە و لە گەرەکە دارزاوەکانی پاریس و لەندەندا ناژی. بن لادن هەروەها پیاوێکی پەراوێزکراوی نێو دونیای ئیسلام نییە. بن لادن یەکێکە لە بەرهەمە هەرە گەورەکانی بازاڕی پترۆل و ئابووری جیهانیی. ئەو کەرەستانەش کە بەکاریاندەهێنێت، نوێترین بەرهەمی تەکنۆلۆژیان، ئاخر کام دەرهێنەری هۆلیوود دەتوانێت تەسویری ١١ي سێپتەمبەري ٢٠٠١ بەوشێوەیە بکات؟

> **"ئەوەی زیاتر دەمانخاتە ژێر کاریگەرییەوە، سەرکەوتنی تەکنیکیی و جەمالیەتی ڕووداوەکەیە. تێرۆریستەکان، هەموو کەرەستەکانی تەکنۆلۆژیایان بە وردترین شێوە بەکارهێنا. ئەوان پێشتر بیریان لەوە کردبووەوە کە ئەم ڕووداوە تەسویر دەکرێت و ڕاستەوخۆ پەخشدەکرێت، بۆیە ویستبوویان بە جوانترین شێوە فیلمەکە ئیخراج بکەن. ئەو ڕۆژە ئێمە هەموومان، ڕاستەوخۆ**

تەماشاکاری فیلمێک بووین، کە بۆ هەموو
دونیا نمایشدەکرا"[10]

### ٣- ١١سێپتەمبەر وەک سامبۆل.

راستە ئەم رووداوە لەرووی مرۆییەوە، تراژیدیایەکی گەورەیە.
راژیدیایەک لەبیرناچێتەوە. بەڵام ئەوەش راستە کە ١١ي
سێپتەمبەري٢٠٠١، تەنها رووداوێکی تراژیدیی نییە، بەڵکو ئێستا
ۆدێکە بۆ کردنەوەی هەزاران مەلەف. سامبۆلێکە بۆ ناسینەوەی
ەزاران کردەو رەفتارو بیرکردنەوەو جولان. ١١ي سێپتەمبەر،
اقیعێک دەخاتە بەردەستمان، واقیعی جەنگێک کە ئیتر کارناکات
ەسەر داگیرکردنی جوگرافیایەکی گەورە، بەڵکو لەسەر کاردانەوەو
ەنگدانەوەی هێرشەکانی لەدونیادا، گرەو دەکات. بۆنموونە:
لە ١١ي مارسی 2004دا ئەلقاعیدە تێرۆریستانە هێرشدەکاتە سەر
ەمەندەفەرەکانی مەدرید. گرنگیی ئەم رووداوە تەنها لەوەدا نییە کە
ەند کەسیان کوشت، بەڵکو لەوەشدایە کە حکومەتێک لادەبات و
کومەتێکی دیکە لە شوێنەکەیدا دادەنێت. راستڕەوەکان لادەبات و
ۆسیالیستەکان دێنێتە سەر حوکوم. لە 15ي ئەپریلی 2004دا
سامە بن لادن هودنەیەک دەخاتە بەردەستی وڵاتانی ئەوروپا. ئەو
م کارەی هەموو رۆژنامە و تەلەفزیۆنەکان دەهێنێتە قسە. لەوەش
یاتر حکومەتەکان ناچاردەکات هەڵوێستی خۆیان روونبکەنەوە.
ەترسیی ئەم جەنگە لێرەدایە. ئەم جەنگە، لەرێگای سامبۆلەکانەوە،
رێگای کۆدەکانەوە، لەرێگای تۆرەکانی کۆمۆنیکاسیۆنەوە، لەرێگای
کنۆلۆژیای نوێوە، بەرهەمدێت.
راستە هەر لەکۆنەوە سامبۆل و واقیع لەیەکتر ئاڵاون، هەموو
قیعێکیش لەرێگای سامبۆلێکەوە گوزارشتی لەخۆی کردووە. بەڵام

ئەمرۆ وەک مانوێل کاستێلس دەڵێت: " خودی واقیع خۆیشی لەنێو وێنەیەکدا تواوەتەوە"[11]. دیارە تەلەفزیۆنیش ڕۆڵێکی سەرەکیی لەم گەردوونە نوێیەدا هەیە. گەردوونی بە سامبۆلکردنی دونیا. لەکاتی هێرشەکانی بن لادندا بۆ سەر بورجەکان، سێ لەسەر چواری ئەمەریکییەکان، ڕاستەوخۆو لەڕێگای شاشەکانەوە دارمانی بورجەکانیان بە چاوی خۆیان دەبینی.

**" بینینی دارمانی بورجەکان، ڕاستەوخۆ لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان، تێکەڵاوبوونێکی ئاشکرای چرکەکان بوو. لەو ساتەدا، ئیتر زەمەن و مەسافە وەک دوو شت نەبوون. ئیتر ئێمە، هەموو تەماشاکارانی دونیا، لەڕێگای شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە، لەوێ بووین. کەس نەمابوو لەوێ نەبێت. شاشەکان، ڕاستەوخۆ سوتانی ئەوبەری ئۆقیانوسیان پێنیشاندەداین، ئەوبەرێک، کە لە تراژیدیادا نوقوم بووبوو... ئەو وێنانە هەرچەند هەندێجار فریودەرن، بەڵام کاراییان باڵاتر و زیاترە لە کارایی خودی ڕووداوەکە."[12]**

لە ساڵی 1991دا، کە ئەمەریکا جەنگی ڕزگارکردنی کوێت دەکات و پەلاماری عێراقی سەددام حوسەین دەدات، ئێمە تەنها ئەو وێنانەمان دەبینی کە ئەمەریکا بەدونیای دەبەخشی. چونکە ئەوسەردەمە، ئەوان کۆنترۆڵی وێنەیان لەدەستابوو. گەلانی ئەورووپا و ئەمەریکا تەنها ئەو موشەکانەیان دەبینی کە بەتەکنۆلۆژیای نوێ ڕێنموونیی دەکران، بەڵام قوربانییەکانی ئەو موشەکانە دیارنەبوون. لە 1991 تا 2001 دونیا بەتەواویی دەگۆڕێت. ئیتر ئەمەریکا بەتەنها کۆنترۆڵی وێنە ناکات.

2001 ئەوەی وێنە بەکاردێنێت تا ئاستی کۆنترۆڵکردن، ئەمەریکای سەرۆک بوش نییە، بەڵکو بن لادنە. پیرە فەیلەسوفی فەرەنسی، جاک ـێریدا، پێش مردنی بە جوانترین شێوە گوزارشتی لەم بارودۆخە وێیە کرد. ئەو لە کتێبە نایابەکەی لەسەر ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١، ـەگەڵ هابرماسدا دەنووسێت:

**"هەموو ئەو لایەنانەی کە تێهەڵچوون لە جەنگی دژ بە تێرۆریسمدا، ناتوانن رۆژانە باس لە تێرۆریسم نەکەن. گرفتەکە لێرەدایە، چونکە هەر قسەکردنێک لەسەر تێرۆریسم بازووی تێرۆریسم بەهێزتر دەکات، هەر قسەکردنێک لەسەر تێرۆریسم، واتە بەخشینی مەکانەتێک بە تێرۆریسم، واتە خستنە سەرشانۆی، واتە بەئامانجکردنی. و لێرەوە سیستێمی سیاسیی و زانیاریی، کە ئەرکی پاراستنی هاوڵاتیانیان لە مەترسیی تێرۆریسمی جیهانیی پێسپێردراوە، وردە وردە لاواز دەبێت."**[١٣٠]

ـبوون و نەبوونی ئوسامە بن لادن گرنگە، بەڵام ئەوەی زیاتر گرنگە ـرۆریسمە، کە لە هەموو جێگایەکی ئەم دونیایەدایە و لە ڕێگای ـێنەکانەوە خۆی دەگەیەنێتە هەموو ماڵێکی دونیا.

لەهەمانکاتدا دەبێت ئاماژە بەوەشبدەین کە شۆکی وێنەکان، ـانێکی زۆریان بە ئیسلامسیتەکان و ئیسلامی سیاسیی و تەنانەت ـسوڵمانانیش گەیاند. غەرقبوونی سەدان هاوڵاتی لە تەپوتۆزداو ـۆفرێدانە خوارەوە لە بورجەکان و ئەو مەسیجانەی کە لەسەر ـەلەفۆنەکان بەجێهێڵرابوون و وردوخاشبوونی بورجەکان ـسەریەکتریدا، دونیایان دژ بە ئیسلامیسم و پرۆژە تێرۆریستییەکەی

ورووژاند، تا ئەو رادده‌یەی کە سەرۆکی فەرەنسا دەڵێت: ئەمرۆ ئێمە هەموومان ئەمەریکین، و تەنانەت رۆژنامەی لۆمۆندیش لەسەر لاپەرەی یەکەمی بە گەورەیی دەنووسێت: ئێمە هەموومان ئەمەریکین.
ئیتر لەو رۆژە بەدواوە، ئیسلامسیتەکان، جێگای ژاپۆنییەکانی جەنگی دووەمی جیهانیی و کۆمۆنیستەکانی جەنگی ساردیان گرتەوە. لەو رۆژە بەدواوە، سەرۆک بوش جلی سەربازیی لەبەردەکات و لە یەکێ لە بنکە سەربازییەکاندا جەنگی " ئازادیی بێسنوور" رادەگەیەنێت. موحەمەد ئارکۆن لە کتێبی " لە مەنەتانەوە بۆ بەغداد" دا، ئەو وتارەی سەرۆک بوش نەقڵدەکات کە لەبەردەم کۆنگرێسدا پێشکەشیکرد، پێموایە لێرەدا گرنگە ئاماژە بە پەرەگرافێکی ئەو وتارە بدەین:

> **" باشە ئەو هێرشانە چۆن و بۆ روویاندا؟ ئەو تیرۆریستانە حیقدیان بەرامبەر ئێمە هەیە. ئەوان رقیان لەو ئازادییەیە کە هەمانە، رقیان لەو ئازادیی ئاینەیە کە هەمانە، رقیان لە ئازادیی رادەربرینە کە هەمانە. رقیان لە مافی دەنگدانمانە... ئەو تیرۆریستانە دەیانەوێت شێوەی ژیانمان بگۆرن."[١٤٠]**

لەراستییدا نیۆیۆرک، بەتەنها شارێک نییە، بەڵکو مەڵبەندی هەموو رەگەزو رەنگ و زمان و دەنگەکانە. لە نیۆیۆرکدا ئەوانە هەموو بەیەکدەگرن و لەگەڵ یەکتردا تەفاعولدەکەن. نیۆیۆرک شاری هەموو ئاینەکانە. سەنتەری بازرگانیی، لەراستییدا سامبۆلی قودرەتی مرۆڤایەتیی ئەم سەردەمەبوو. هێمای شارستانیەتي نوێ بوو. لێرەوەیە کە کۆلین پاول دەڵێت: ئەو هێرشانە بە تەنها دژی ئەمەریکا نەبوون، بەڵکو دژی دونیای شارستانیەت بوون.

## ٤- ١١ سێپتەمبەر لە خەیاڵدانی موسوڵماناندا

بۆ ئەوەی لە خەیاڵدانی موسوڵمانان تێبگەین، چەند ڕەگەزێکی
وونیادنەر هەن کە دەبێت بینانخەینە سەر ئاو: سەرەتا دەبێت
ـەوەمان لەبیرنەچێت کە یەکەم ڕۆژنامەی چاپکراو لەنێو خاکی
یسلامداو لە میسر، لەسەر دەستی پۆناپارت بوو. یەکەم ڕادیۆ کە
ـەعەرەبی دەدوا، ڕادیۆی ئیتالییە فاشیستەکانی ساڵی 1934 بوو.
ەڵام ئەمڕۆ زیاتر لە 452 کەناڵی سەتەلیت بەزمانی عەرەبی دەڕژێت
ـەسەر دونیای ئیسلامدا. و زیاتر لە 36 ملیۆن تەلەفزیۆن لە
ۆژهەڵاتی ناوەراستدا هەیە[١٥]. لە ئەمڕۆدا ئیتر ڕۆژئاوا ناتوانێت وەک
ـاران کۆنترۆڵی ئامێرەکانی کۆمۆنیکاسیۆن و گەیاندن و ڕاگەیاندن
کات. تەنها عەرەبیی سعودی دوو گەورە مەڵبەندی کۆمۆنیکاسیۆنی
ـهیانیی هەیەو بە 10 زمان سعودیە دەگەیەنن بە جیهان. لەنێو
ـەرگەی ئەوروپاشدا دەیان مەڵبەندی گەورەی ڕاگەیاندنی هەیە.
ێران بە دەیان کەناڵی سەتەلیتی هەیەو دەعمی سەدان مەڵبەندی
اگەیاندن لەجهیاندا دەکات. ئیسلامیستەکان، لەهەموو دونیادا، ئێستا
اوەنی تەلەفزیۆن ورۆژنامەو گۆڤارن. لە کوردوستاندا، یەکگرتوو-
ۆمەڵ خاوەنی چەندین کەناڵی خۆ-دەربڕین و خۆ-گەیاندنن. لە
کستان، لە کوێت، لە ئوردون، لە ئەندەنوسیا، لە فەرەنسا، لە
ەریتانیا، لە ئەفەریقا، هتد، ئەوان خاوەنی کەرەستەکانی
ـۆمۆنیکاسیۆنن.

بەشێکی هەرەزۆری ئەو تەلەفزیۆن و ڕۆژنامانە، ڕۆژانە و
ستەوخۆ، پرۆگرامەکانیان لەسەر زەبروزەنگ و ڕووداوەکان و
ندوتیژیی ئیسرائیل بەرامبەر بە فەلەستینییەکان پێشکەشدەکەن.
ەروەها، وێنەکانی عێراق لە گەمارۆوە تا جەنگ و تا داگیرکردن و
ئەوەی ڕۆژانە ڕوودەدات، نەقڵدەکەن، دیارە لەگەڵ ڕاڤەکردنێکی
سلامیستانەدا. لێرەدا نابێت ڕۆڵی کەناڵی الجزیرة مان لەبیربچێت.

دیاره ئەمەریکییەکان تەواو لەم کەناڵە نارازین و لەچەندین بۆنەدا بێزاریی خۆیان لەو کەناڵە دەربڕیوە. بەتایبەتی لەسەر ئەو بەرنامانەی کە لەسەر فەلەستین و عێراق و ئەفغانستان و ئوسامە بن لادن پێشکەشیدەکات. ئەمەریکییەکان، بۆ دژایەتییکردنی کەناڵی الجزیرة کەناڵی الحرة یان دامەزراند و تەنها بودجەی دامەزراندنەکەی 62 ملیۆن دۆلار بوو. بەڵام ئایا ئەم کەناڵە توانی کارایی الجزیرة کەمبکاتەوە؟ بێگومان نەخێر. تەنها لە مەغریبی عەرەبیدا 63% ی دانیشتوان تەماشاکاری الجزیرەن و بە باشترینی لەقەڵەمدەدەن[١٦].
دیارە ئەم سەرکەوتنەی الجزیرة فرە هۆکارە، بەڵام هەرەگرنگەکەیان بریتییە لە تەسلیمنەبوونی نە بە ئەمەریکا و نەبە حکومەتە عەرەبییەکان.

کەناڵی المناری سەر بە ( حزب الله )ی لوبنانی، بەهۆی پەخشکردنی زنجیرەیەکی تەلەفزیۆنییەوە، کە دەبوو بەهۆی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی دژ بەجولەکە، لەسەر داوای CIA لەفەرنسادا داخرا. ئەم ڕووداوە مایەی ڕامان و سۆراخکردن و توێژینەوەیە و دەکرێت ئێمە فەحسی ئەوکاراییە بکەین کە هەواڵ و گەیاندنی زانیاریی لەسەر جیهانی ئیسلامیی دادەنێن.

ئێستا جیهانی موسوڵمانان، لەسەر ئاستی کردار، زەمەنی کۆتوزنجیرکردنی هەواڵ و زانیاریی و سانسۆر خستنەسەر ڕاگەیاندنی تێپەڕاندووە. ئێستا هیچ ڕژێمێکی دیکتاتۆریی توانای ئەوەی نەماوە موسوڵمانان لە پەیوەندیی ڕاستەوخۆ بەجیهانەوە بێبەشبکات. نەک لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، تەنانەت لە قەراخەکانی پاریس و لەندەن و بەرلین و ئەمستردامدا، لەو شوێنانەی کە موسوڵمانانی تیادا نیشتەجێیە، ژمارەی سەحنەکانی سەتەلیت بەسەر ماڵان و دیوارو بالکۆنەکانەوە، ئەو دیاردەیەیە کە سەرنجی هەموو کەسێک ڕادەکێشێت. موسوڵمانان ئێستا هەموو سەری سەعاتێک و لە

ڕێگای کەناڵەکانەوە، ئاگایان لەهەموو دونیایە. فەلەستین و عێراق و ئەفغانستان و کشمیر و شیشان، چرکە بە چرکە دەرژێتە نێو ماڵەکانیانەوە. کە سوونەت، کچە موسوڵمانی فەرەنسی تەمەن پانزە ساڵ، سەری خۆی دەتاشێت بۆئەوەی کەس قژی نەبینێت و لەهەمانکاتدا بتوانێت بگەڕێتەوە بۆ قوتابخانە، لەڕۆژی داهاتوودا، موسوڵمانێک لەبنی دونیا بەم هەواڵە دەزانێت و جاک شیراکی پێ تاوانباردەکات.

بەڵام ئایا فۆندامۆنتالیستە نوێیەکان، تیرۆریسمی ئیسلامیی بێسنوور چۆن کەڵک لە سەردەمی کۆمۆنیکاسیۆن و زانیاریی و تەکنۆلۆژیای نوێ وەردەگرن؟

لە ساڵی 2002دا، بەڕێوبەری CIA لەسەر ئەم پرسیارە بەدەنگدێت و دەڵێت:

> **"لەڕێگای ئینتەرنێت و کەرەستەکانی دیکەی کۆمۆنیکاسیۆنەوە، ئەمرۆ گروپێک بەبێئەوەی کە پێویستی بە لیدەرشیپ یان بوونیەیەکی ڕێکخراوەیی هەبێت، دەتوانێت دروستببێت و هەرکاتێک ویستی گورزی خۆی بووەشێنێت"[١٧٠].**

نیۆ-فۆندامۆنتالیسمی ئیسلامیی، کەرەستەکانی کۆمۆنیکاسیۆن بەتەنها بۆ گورزوەشاندن بەکارناهێنێت، بەڵکو بۆ دروستکردن و بیناکردنی خەیاڵدانێکی فۆندامۆنتالیستییانەش بەکاریاندەهێنێت. وتارەکانی ئوسامە بن لادن و دکتۆر ئەیمەن زەواهیری، لەپاش ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١، لەسەر الجزیرة و ئینتەرنێت، بەشدارییەکی زیندوویان لەدروستکردنی خەیاڵدانی موسوڵمانان لەهەموو جیهاندا کردووە. تەنانەت بزووتنەوە ئیسلامییە میانرەوەکانیش نەیانتوانیەوە لەژێر هەیمەنەی گوتارەکانی بن لادن و زەواهیری دەربازببن. ئەمە

بەهیچشێوەیەک مانای ئەوەنییە کە پەیوەندییەکی تەنزیمیی لەنێوان بن لادن و ئەو بزوتنەوانەدا هەبێت. لێرەدا قسە لەسەر ئەوە نییە. بەپێچەوانەوە، بەشێکی زۆر لەو بزوتنەوانە، تەنانەت ئیدانەی هێرشەکانیشیان کرد. لێرەدا ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە، ئاستێکی ترە کە بریتییە لە ژیانی هەموو رۆژێک. واتە بن لادن لەوەدا زۆر چالاکانە توانیویەتی خەیاڵدانی ژنێکی تەمەن شەست ساڵانەی موسوڵمانی هەڵەبجەی تازە لە کوردوستان و ڤێنیسیۆ لە فەرەنسادا، لەسەر ١١ي سێپتەمبەر بینابکات. بن لادن لە کۆی گوتارەکانیدا دەڵێت، تا بمانکوژن، دەتانکوژین، تا ئاسایشمان تێکبدەن ئاسایشتان تێکدەدەین، تا بمانترسێنن دەتانترسێنین. ئەمە هەمان ئەو دەربڕینانەن کە هەرجارەو بەشێوەیەک لەسەر پەیوەندیی نێوان رۆژئاواو رۆژهەڵات دەدرکێنرێن. سەرکەوتنی ئەم گوتارە، بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ سادەییەکەی و ساکارییەکەی. ئاخر ئەمرۆ موسوڵمانان نایانەوێت خۆیان ماندووبکەن بە خوێندنەوەی تەحلیلەکانی موحەمەد ئارکۆنێک کە لەنێو موختەبەرەکاندا خەریکی سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی ئیسلامە، ئەوان فەیلەسوف و سۆسیۆلۆگ و ئەنترۆپۆلۆگ و پۆلیتۆلۆگیان بۆچییە، لەکاتێکدا کە بن لادن بە وتارێک هەموو شتێکیان پێبڵێت؟

ئەوانەی کە بەتوندیی ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١یان ئیدانەکرد، بەشێکی زۆریان ئەو رۆشنبیرە موسوڵمانانە بوون کە کاراییان لەسەر کۆمەڵگەکان تەواو لاوازە. ئەو رۆشبیرانە خۆشیان قوربانیی دەستی هەمان تیرۆریسمن. لەهەمانکاتدا تەنانەت ئەو رۆشبیرانەش لەنێو خۆیاندا پارچەپارچەن و دەڵێن چۆن دەتوانین ١١ي سێپتەمبەر ئیدانەبکەین، بەبێ ئیدانەکردنی هەموو ئەو تاوانانەی کە بە موبارەکەی ئەمەریکا لە هەموو دونیادا ئەنجامدەدرێن؟

# بەشی دووەم

# لە لۆژیکی کۆمەڵگەوە بەرەو لۆژیکی جەنگ

## ١. *سەرەتا.*

پاش کۆتاییهاتنی جەنگی دووەمی جیهانیی، گەران بەدوای دروستکردن و بیناکردنی نەتەوەی نوێدا، دەبێت بە یەکێک لە سیما هەرە درەوشاوەکانی مێژووی نوێمان. وڵاتانی پاش سیستێمی کۆلۆنیال و تەنانەت هەندێ وڵاتی کۆمۆنیست و بەشێک لە وڵاتانی رۆژئاواش، تێکەڵ بەم سیاسەتە دەبن. سیاسەتی دروستکردنی نەتەوەی نوێ و ئابووری نوێ و باشکردنی هەلومەرجی ژیانێکی نوێ، بەتایبەتی بۆ کرێکاران.

لەوساتەدا دەوڵەت وەک باوکی هاوڵاتیان خۆی پێشنیازدەکرد و ئەرکی ژیانی ئابووریی و کۆمەڵایەتییانی دەگرتە ئەستۆ. ئەم کارەش، کاری بەباوک بوون، لەو قۆناغەدا، تەنها بەدەوڵەت دەکرا، لەبەرئەوەی بەشێکی گەورەی سەرچاوەکانی ئابووری لەژێردەستدابوو، بەو سەرچاوانە دەیتوانی نەخشە بۆ سیاسەتێکی ئابووریی دابرێژێت. هەروەها لەبەرئەوەی گۆڕانکارییەکانی پاش جەنگی دووەمی جیهانیی لەوە گەورەتربوون کە دەوڵەت نەیەتە دەنگ بۆ باشکردنی هەلومەرجی ژیانی هاوڵاتیان و تەنانەت بۆ دروستکردنی کێڵگەیەکی نوێتر بۆ سیاسەتکردن. ئەو گۆرانکارییانە سروشتی دەوڵەتێکیان دەویست کە تەنها تەماشاکار نەبێت، بەڵکو بەشداربێت و بەرپرسیارێتیی خۆی بەباشیی بگرێتە ئەستۆ. واتە ئیتر

دەوڵەت دەبوو بەرپرسیاربێت لە راپەرندانی ئەرکەکانی سەرشانی لە هەموو بوارەکاندا، بواری ئابووریی، کۆمەڵایەتیی و هتد.

بەڵام بەداخەوە هەندێکجار بەناوی بەرپرسیارێتییەوە، دەوڵەت لە خزمەتکارەوە دەبوو بەجەللاد. لەبری ئەوەی هەموو تواناکانی بخاتەکار بۆئەوەی هاوڵاتیان بپارێزێت، بەدەستی خۆی دەیکوشتن، لەبری ئەوەی ئازادییەکانیان بۆ دەستەبەربکات، بەدەستی خۆی دیلی دەکردن. لەبری ئەوەی هەلومەرجی ژیانی ئابوورییان بەرەوپێشەوە ببات، بەدەستی خۆی بێدەرامەت وهەژاری دەکردن، لەبری ئەوەی لەکاتی مەترسییەکاندا پەنایانبدات، خۆی دەبوو بە مەترسییەکی بەردەوام لەسەریان. باشترین نموونە، عێراقی سەدام حوسەین و لیبیای کۆلۆنێل قەزافی و یۆگۆسلافیای سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچە. هەرچەند دەتوانین دەیان نموونەی دیکە بێنینەوە. لەهەمانکاتدا، لە زۆربەی زۆری وڵاتانی ئەورووپاداو لەگەڵ سەرلەنوێ بیناکردنەوەی ئابووری و بەرەوپێشەوە چوونی رەوتی پیشەسازییدا، دەوڵەت ماکینەی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکانی دەخستەکار و سەدان دەزگای کۆمەڵایەتیی خزمەتگوزاریی دادەمەزراند. واتە بەقەدەر پێشکەوتنی رەوتی ئابووریی رەوتی کۆمەڵایەتییش پێشدەکەوت. لەم گەردوونەدا ئیتر دەوڵەت هەوڵیدەدا هاوڵاتیان لە زەبروزەنگی گورزەکانی ئابووریی بپارێزێت. لە ئەورووپادا، ئیتر ئابوورییەک کە هەڵگری خەونە کۆمەڵایەتییەکان بێت، وەک ئامانجێکی پیرۆز تەماشادەکراو خەباتی لەپێناودا دەکرا. تەواو بە پێچەوانەی مۆدێلی ئابووری ئەمەریکییەوە، کە هەڵگری هیچ خەونێکی کۆمەڵایەتیی نییە و لەدەرەوەی هەموو ئەخلاقێک ئیشدەکات.

لە ئەورووپادا ئەم بەباوکبوونەی دەوڵەت دروست دەرۆشت بەرێوە، چونکە کۆمەڵگەی مەدەنیی و دەزگاکانی، خۆیان بۆ خۆیان، چاودێری بەردەوام بوون بەسەر دەوڵەتەوە. گەرنا، لەو جێگایەی کە کۆمەڵگەی

مەدەنیی تیایدا بەهێزنییە، هەر بەباوکبوونێکی دەوڵەت تارمایی بەجەللادبوونێکیش بە چەند هەنگاوێک لەپێشیوە رێدەکات.

کۆمەڵگەی مەدەنیی، تا نزیکەی سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکیش، دەیەوێت دەوڵەت بەو ئاراستەیەدا ببات کە ئەرکی ناسیۆنالیزەکردنی چالاکییە ئابوورییەکان بگرێتە ئەستۆی خۆی، چونکە ئەو ئاراستەیە زەمانەتێکی گرنگە بۆ پێشکەوتنی وڵات. رەنگە ئەم تێزە رێگای تێگەشتنمان لەو سەدان مانگرتنە رۆژانەیەی ئەوروپییەکان بۆخۆشبکات. ئاخر هەرکاتێک کە دەوڵەت بیەوێت مەیدانێ لە مەیدانەکانی ئابووری تەسلیم بە کەرتی تایبەت بکات، دەبینین هەزاران کەس دەرژێنە سەرجادەکان و ماندەگرن و لەدژی هەنگاو بەرەو دارنینی ئابووری لە کۆمەڵایەتیی هوتافدەکێشن. لە ساڵی 1995 کۆمەڵگەی مەدەنیی و مانگرتنەکانی حکومەتەکەی ئالان جووپێ دەروخێنن و جاک شیراکی سەرکۆمار ناچاردەکەن کە کابینەیەکی دیکە دروستبکات.

بەڵام سەرەڕای ئەم هەموو بەرگرییە، سەرەڕای ئەم هەموو رژانە سەرجادەو مانگرتن و هوتافکێشانە، مۆدێرنیتێ وردە وردە پێدەنێتە نێو گەردونێکی دیکەوە. گەردونێک کە لەسەر کارگەی ئازاد و بازاڕی ئازاد خۆی دادەمەزرێنێت. ئەم گەردوونە دەکرێت ناوی بنرێت پۆست مۆدێرنیتێ (دێریدا [١٨]) یاخود دیوی دووەمی مۆدێرنیتێ (هابرماس[١٩]) یان مۆدێرنیتێی پێشکەوتوو (تۆرێن[٢٠]). راستە ناونان گرنگە، بەڵام ئەوەی گرنگترە ناسینی ناوەوەی ئەم گەردوونە تازەیەیە، دۆزینەوەی ئەو ماکینەیەیە کە دەیبات بەرێوە، دەستگیرکردنە لەو ستراکتۆرانەی کە لە دروستکردنێکي بەردەوامدان.

لەم گەردوونەدا ئیتر ئابووری زۆر کەمتر لەجاران کلیک لەسەر فیلە کۆمەڵایەتییەکان دەکات، زۆر کەمتر لە نۆرمەکانی پێشوو

نزیکدەبێتەوە. ئەگەر لە قۆناغی رابردوودا، دەوڵەتی باوک مافی ئەوەی هەبوو‌بێت کە ناسیۆنالیزەی سەرچاوەکانی داهات بکات و ئابووری بە کۆمەڵێک نۆرمی کۆمەڵایەتیی و ئەخلاقییەوە گرێبدات، ئەوا لەم گەردوونە نوێیەدا، ئەنتەرناسیۆنالیزەبوونی سەرچاوەکانی بەرهەمهێنان و داهات و گۆرینەوەو ناردن و هاوردن، ئەم دەسەلاتە بەتەواویی لەدەوڵەت دەسەنێنەوەو دەوڵەت ئیتر بێلایەن دەکرێت.

لە ناوەوەی ئەم گەردوونە نوێیەی مۆدێرنیتێدا، ئەم رەگەزانە بەردەوام وەک ستراکتۆر بینادەکەن: بە جیهانییبوونی بازاڕ، گەشەکردنی ئەو کارگانەی کە هەڵگری سیفەتی ئەنتەرناسیۆنالن، دروستبوونی تۆڕی بەمانا کاستێلسییەکەی (مانوێل کاستێلس[21])، سیستەمێکی کارای سەرمایە کە دەتوانێت لە زەمەنی هەنووکەییدا زانیاریی بگەیەنێت، ئامادەیی نوێی میدیا و ئینتەرنێت بەتایبەتی. هەموو ئەمانە بەشێکن لەو بوونیەییانە کە بوونیە بینا دەکەن لەنێو ئەم گەردوونە نوێیەدا، کە زۆرجار بە گلۆبالیزاسیۆن ناودەبرێت. بەدیوێکیتردا دەتوانین بڵێین ئەمە ئەو ئەمەریکایەیە کە دەبێت بە جیهان، یان ئەوە جیهانە کە دەبێت بە ئەمەریکا. واتە، ئێمە ئەمرۆ تەماشاکاری دۆرانی مۆدێلی ئەوروپی و بردنەوەی مۆدێلی ئەمەریکین.

بێگومان هەر لەسەرەتای دروستبوونی ئەم گەردوونەوە، لەهەموو جیهاندا، بەملیۆنەها مرۆڤ دارژانە سەرجادەکان و ئێستاش دەرژێنە سەرجادەکان و هەموو بە یەکەوە لە دژی بەئەمەریکایی بوونی جیهان هوتاف دەکێشن. بەشێکی زۆر لە توێژەرانی زانستە کۆمەلایەتییەکان پێیانوایە کە ئامادەبوونی ملیۆنانەی خەڵکی دژ بەم مۆدێلە، قورساییەکی گەورەی هەیە لەسەر رای گشتیی و ئاراستەکردنی بەشێک لە رووداوەکان. بەقەدەر گەورەبوون و گەشەکردن و فراوانبوونی پرۆژەی بەئەمەریکاییکردنی جیهان،

پرۆژەی دژیش دروستدەبێت و نایەوێت چۆکدابدات. لە فەرەنسادا ئەم بزووتنەوەیە پێیدەگووترێت: ئەلتەرمۆندیالیزاسیۆن. ئەلتەرمۆندیالیستەکان، دژی جیهانیبوون نین. بەپێچەوانەوە ئەوان لایەنگری گلۆبالیزاسیۆنن، بەلام بەمەرجێک ئەمەریکی نەبێت و هەلگری خەونە کۆمەلایەتییەکان بێت.

## ٢. جیهانگیریی وەک بازاڕی سەرمایەدارەکان.

لەراستییدا ئەو جەنگەی کە ئێستا لەگەڵ گلۆبالیزاسیۆن-جیهانگیرییدا دەکرێت، ئەو گرنگییەیش کە بەم کۆنسێپتە دەدرێت، بەتەنها لەبەر رەهەندە ئابوورییەکەی نییە، بەڵکو لەبەر رەهەندە ئایدۆلۆژییەکەشیەتی. ئەوانەی کە تەپڵی سەرکەوتنیان بۆ جیهانگیریی لێدا، دەیانویست پێمانبڵێن کە ئیتر لەمەودوا هیچ دەسەلاتێک نییە بتوانێت سنوور بۆ ئابووری و بازارو کرین و فرۆشتن و کارگەکان و کالاکان دابنێت، چونکە ئابووری بەجیهانییکراو سنورەکان وەک لاپەرە دەدرێنێت و وەک قەوالە سەروەرییەکان دەپێچێتەوە. لێرەوە رەهەندە ئایدۆلۆژییەکەی جیهانگیریی، وەک کۆتەرە سەرئاو دەکەوێت. ناوەرۆکی گلۆبالیزاسیۆن بریتییە لە کارکردن بۆ بیناکردنی سەرمایەدارییەکی بێسنووری توندرەوی پارێزراو لە دەسەلاتی هەموو کارایەکی دەرەکیی، ئازاد لە هەموو کۆتوزنجیرێک. ئەوی ئەم هەموو گۆرانی بۆوتن و جنێوپێدان و سەمابۆکردن و تفتێکردنەی دروستکردووە، لەراستییدا ئەم ئایدۆلۆژییە سەرئاو کەوتووەیە[٢٢].

لە قۆناغی رابردوودا، هەر ولاتێک خاوەنی سەرمایەداریی تایبەت بەخۆی بوو، سەرمایەداریی لکابوو بە مێژووی ناسیۆنالەوە. بەلام لەم گەردوونە نوێیەدا، ئیتر سەرمایەداریی ناسیۆنال شکستدەهێنێت و ئیفلیجدەبێت، چونکە ئەوەی لە ئەمرۆدا یاساکانی یارییەکە دیارییدەکات FMI (سندوقی نەقدی دەولی- Le Fond Monétaire

International) و OMC (رێکخـــراوی بازرگـــانیی جیهـــانیی- L'Organisation Mondiale du Commerce) ن. ستراتیژیەتی ئـەم دوو دەزگایـە بریتییـە لـە زاڵکـردن و سـەپانـدنی چوارچێـوە ئابوورییەکانە بەسەر هەموو دەوڵەت و کۆمەڵگەکاندا. ئەوەی ئەم دوو رێکخراوە بیری هـەرگیز لێناکـەنەوە، گرفتە کۆمـەڵایەتییـەکانن. هـەر لـەدایکبوونیـەوە تائێـستا، ئـەم بیرکردنـەوەو ئایدۆلۆژیایـە، لـەلایـەن پارێزەرانی لۆکالگەرایی و نەتەوەگەراییەوە بەتوندیی دژایەتیی کراوە. ئـەم ئـەکتـەرانـە ئەوەی دەیانترسێنێت، ژێرپێکـەوتنـی بـەرهـەمهێنـانی خۆمـاڵیی و کولتـوری خۆمـاڵیی و گرفتە کۆمـەڵایەتییە خۆماڵییەکانە. جۆزیـە بۆفیـەی فـەرەنـسی، لـەهـەرکوێیـەک دەگـات بـە ماکدۆنالـدێک پـەلاماریـدەدات و ژیـانی لـەنێـوان زینـدان و شـکاندنی ماکدۆنالـددا بەسەردەبات. لە ئەمرۆدا جەنگی نێوان (لۆکال) و (گلۆبـال)، لـەهـەموو دونیادا بـەردەوامە. ئـەم جـەنگە لـەهـەر جێگایـەک شێوازێکی تایبـەتی سامبۆلێک لەخۆدەگرێت.

لەهەمانکاتدا کەمنین ئەو سۆسیۆلۆگ و فـەیلەسـوف و رۆشـبیرانەی پێیانوایە کە، هـەڵوەشـانەوەی کۆمـەڵگەکـان و دەوڵـەتەکـانی نـەتـەوە، سەرەتای بیناکردنی ژیانێکی نوێی سیاسیی و کولتوریی و ئابوورییە و سـتەمێکـی زۆر لـەخۆمانـدەکـەیـن گـەرپێمانوابێـت گلۆبالیزاسـیۆن بەتـەنها هـەڵگری لـۆژیکێکی ئابوورییە. و پێیانوایـە کە ئێمـە لـەسـەر رێگای دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی جیهانیین. ئەوان دەڵێن، دەوڵـەتی نەتەوە، بۆ خۆبیناکردنی، دەبوو هەموو تیرەو کەمایەتیی و ئێتنیی و گروپـە لۆکالییـەکـان هـەڵبـووەشـێنێتەوەو بـەوپـەری زەبـروزەنگـەوە لەهەموو ئەو بەربەستانە بدات کە رێگا لە دەوڵـەتـی نـەتـەوە دەگرن. ئـەم پـرۆژەیـەش مێژوویـەکـی درێـژی خایانـد. لـەئێـستاشدا، کـە گلۆبالیزاسیۆن لەسەر هەمان رەوت دەیەوێت کۆمەڵگەیەکی جیهانیی دروسـتبکات و بـۆ ریـالیزەکردنـی ئـەم پـرۆژەیـەش دەبێـت تـەواوی

کۆمەڵگە نەتەوەییەکان و کولتورە نەتەوەییەکان و دەزگا نەتەوەییەکان هەڵبوەشێنێتەوە. لێرەوە هەمووومان دەبین بە هاوڵاتی یەک جیهان و یەک سیستێم لە بەها و ئەخلاق هەموومان دەبات بەرێوە!

لەراستییدا ئەم گریمانەیە جێگای مشتومڕو توێژینەوەو دێبایە و نابێت وەک حەقیقەت وەربگیرێت. راستە گلۆبالیزاسیۆن رێگا بۆ لەدایکبوونی کۆمەڵگەیەکی جیهانیی خۆشدەکات، بەڵام ئەوەش راستە کە سەرمایەدارە هەرەگەورەکان رەنگی ئەو جیهانە دەکێشن و یاساکانی یارییەکە دیارییدەکەن. راستە کە ئەمرۆ هۆلیوود خەونی هەموو بینەرێکی سینەمایە، بەڵام ئەوەش راستە کە خەڵکێکی زۆری ئەوروپی و تەنانەت ئەمەریکیش ئەوەندەی بەدوای فیلمە لۆکالییەکاندا دەگەرێن، ئەوەندە بەدوای فیلمەکانی هۆلیوودا ناگەرێن. لە پاریسدا، لەپەنای چێشتخانە جیهانییەکاندا، بەسەدان چێشتخانەی تورکی و عەرەبی و کوردی و فارسی و چینی و تایوانی و ئەرمەنیش هەیە و بازاریان هەمیشە گەرمە. لێرەوە دەمەوێت بڵێم کە راستە تەوژمی بەرەو یەک کۆمەڵگەیی زۆر بەهێزە، بەڵام ئەوەش راستە کە تەوژمی فرە کۆمەڵگەییش زۆر بەهێزە. واتە، ئەلتەرمۆندیالیستەکان، لەرێگای تەماشاکردنی فیلمە لۆکالییەکانەوە لەنێو سینەما پەروایزکراوەکاندا و لە رێگای نانخواردن لە چێشتخانە بچووکەکاندا، دەیانەوێت شێوازێک لە بەرەنگارییبوونەوە نومایشبکەن و بڵێن کە ئێمە لێرەین و مەیدانەکە چۆڵناکەین. بەڵام ئایا ئەم بەرەنگارییبوونەوەیە بە کوێ دەگات؟ ئایا بەراستیی لەسەردەمی بەجیهانییبوونی کۆمەڵگەدا، ئێمە دەتوانین پارێزگاریی لە دەزگاکانمان بکەین؟ ئایا دەکرێت بڵێین خۆپیشاندانی ملیۆنەهای خەڵک دژی گلۆبالیزاسیۆن، دەبێت وەک دوا لنگەفرتەی مردنی دونیای رابردوو تەماشابکرێت؟

### ٣. کۆتایی ململانێی چینایەتیی.

لە دونیای پێش ئەم گەردوونەدا، کەرەسەکانی بەرهەمهێنان ڕاستەوخۆ پەیوەندبوون بە کۆمەڵایەتییەوە و تەکنیکی بەرهەمهێنان ملکەچی مەوقیعە کۆمەڵایەتییەکان بوو. لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا، ڕێکخستنی کار لەسەر بناغەی تەرجەمەکردنی تواناکانی کرێکار بۆ قازانجی زیاتربوو. واتە ڕێکخستنی کار تەنها شتێکی تەکنیکی نەبوو، بەڵکو ڕەنگدانەوەی ململانێی چینە کۆمەڵایەتییەکان بوو[٢٣].

بەڵام ژیان لەنێو گەردوونی نوێدا بە پێچەوانەوەیە. واتە ئیتر لێرە کەرەسەکانی بەرهەمهێنان و تەکنیک و ڕێکخستنەکانی کار، تا ئاستێکی زۆر بێلایەنن و خۆیان لەخۆیاندا ڕەنگدانەوەی ململانێی چینە کۆمەڵایەتییەکان نین. بەڵام ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە ئیتر ئێمە لەودیوی پەیوەندییەکانی هەیمەنە و ململانێی چینیدا دەژین؟ بێگومان نەخێر. بەڵام ئەوەی کە ئالان تۆرێن چاودێرییدەکات، ململانێی چینە لەسەر ئاستێکی دیکە. ئەو دەڵێت: لەمەودوا، ململانێی چینایەتیی لەسەر ئاستی گلۆبال و بانکەکانە نەک لەسەر ئاستی کارو ڕێکخستنی بەهەمهێنان[٢٤]. کۆمەڵگەی پیشەسازیی هەر لەسەرەتاوە لەسەر توانایی کارگەکانی بەرهەمهێنان خۆی دروستدەکات، دروستبوونی سەندیکاکانی کرێکارانیش ڕاستەوخۆ پەیوەندە بە ژیانی نێو ئەو کارگانەوە. ئەوە ژیانە لەنێو کارگەکاندا کە کرێکاران فێری مانگرتن و ڕێپێوان و نارەزایی دەربرین و لەیەکترکۆبوونەوە دەکات: بەڵام لەم گەردوونە نوێیەدا، گلۆبالیزاسیۆن بەشێوەیەکی تەواو جیاواز کاردەکات. لێرە، تۆڕەکانی زانیاریی و گۆڕینەوەو پەیوەندییەکانی سەر کۆمپیوتەر، بوونیادی هەموو دونیای پێشووترو کارگەکان و ڕێکخستنی کارو بەرهەمهێنان و پەیوەندییەکانی کارو بەرهەمهێنان

هەڵدەوەشێنێتەوە. لەم گەردوونە نوێیەدا، بەهەزاران کارگە، رۆژانە سەرگەرمی فەسڵکردنی کرێکاران و بچوککردنەوەی قەبارەی مادیی خۆیانن. ئەوەی جاران بەسەد کرێکار دەکرا، ئێستا بە کۆمپیوتەرێک دەکرێت. ئەگەر جاران کرێکاران بەهێزی بازووی خۆیان ماشینەکانیان بەکاردەهێنا، ئەوا ئێستا وێنەی کرێکار تەواو گۆراوەو زیاتر وەک بەکارهێنەری سامبۆلەکان (گوزارشتە بەناوبانگەکەی رایش) دەکرێت ناوزەدەبکرێت. لێرەوە ململانێی چینایەتیی ئیتر وەک خۆر ئاوادەبێت، نەک لەبەرئەوەی کە کرێکار و خاوەنکار ئاشتبوونەتەوەو بوون بە برای یەکتر، بەڵکو لەبەرئەوەی کە ململانێکان سروشتی خۆیان گۆریوەو ئێستا لەسەر ئاستی ستراتیژیەتە جیهانییەکاندا خۆیان مانیفێستدەکەن.

## ٤. ئەلتەرمۆندیالیسم.

بەشێک لە سۆسیۆلۆگ و فەیلەسوف و توێژەرانی فەرەنسی (ئالان تورێن، فرانسوا دوبێ، میشێل ویڤیۆرکا، فەرهاد کۆسرۆکەڤار، هتد)، پێیانوایە کە گلۆبالیزاسیۆن هەرگیز مانای قۆناغێکی دیکە لە مۆدێرنیتێ نییە. بەڵکو تیپێکیترە لە سەرمایەداری توندرەوی بێسنوور و مۆدێرنیزاسیۆن. رەنگدانەوەی کۆمەڵێک گۆرانکاریی مێژووییە لەسەر ئاستی جیهان. ئەگەر جاران جەنگ بریتیبووبێت لە دەرەنجامی ململانێ ناوەکییەکانی هەر کۆمەڵگەیەک، ئەوا ئێستا جەنگ، بەسارد و گەرمیەوە، لەسەر ئاستی ئیمپراتۆرێتەکان وەک مومکینێک دێتە پێشەوە.

ئەگەر لە سەدەی رابردوودا سۆسیالیسم چەکی دەستی نەیارانی سەرمایەداریی بووبێت، لە ئەمرۆدا ئەلتەرمۆندیالیسم چەکی دەستی هەموو ئەو کەسانەیە کە دژ بە جیهانگیریی بە مانای بەئەمەریکاییبوونی دونیایەک کاردەکەن. بەقەدەر سۆسیالیسم

ئەلتەرمۆندیالیسم دژی ئاراستەی سەرمایەداریی و سەرمایەداران و هەیمەنەی سەرمایەیە. بێگومان هیچ کامێک لەم دووانە دژی پێشکەوتنی خودی کۆمەڵگە نین، بەڵکو دژی شێوازێک لە پێشکەوتن و بەرهەمهێنان و ڕێکخستنن. لەم سەر شارەوە، دەبینین، بزووتنەوەی ئەلتەرمۆندیالیست، بەردەوام بانگەشە بۆ ئیدارەیەکی دیموکراتیانەی سەرمایە دەکات، ئیدارەیەک کە بتوانێت گۆرانکارییە مێژووییەکان لە ئازارو خەون و گرفتە کۆمەڵایەتییەکان دانەبرێت و ئابووری بێئەخلاق نەکات. بێگومان لێرەدا ڕۆڵی ئەلتەرمۆدیالیستەکان تەواو جیادەبێتەوە لە ڕۆڵی ئەو سەندیکایانەی کە لکاون بە مێژووی کۆمەڵگایەکی تایبەت و لە ناوەوەی ئەو مێژووە تایبەتەدا دەیانەوێت گۆرانکارییەکان بەرهەمبێنن.

گرفتی هەرە گەورەی ئەلتەر مۆندیالیستەکان لەوەدایە کە خاوەنی ستراتیژیەتی روون و کۆنکریتیی نین و بەرهەمهێنەری گووتارێکی کراوەو گشتیین. و تائێستا نەیانتوانیوە ڕەنگی ئەو کۆمەڵگایە بکێشن کە بانگەشەی بۆدەکەن. ئەمەش وایکردووە کە لە ناوەوەی ئەم بزووتنەوەیەدا هەزاران دەنگ و ڕەنگ و بەرژەوەندیی و پرۆژەی لەیەک جیا هەبێت. لە ناوەوەی ئەم بزووتنەوەیەدا دەبینین فەوزایەک بینینەکان و تەفسیرەکان و کۆنسێپتەکان دەبات بەرێوە. هەندێکجار دەگەینە ئەو قەناعەتەی کە تەنها شتێک ئەو هەزاران مرۆڤە کۆدەکاتەوە، تێکۆشانە لە دژی گلۆبالیزاسیۆن و هیچیتر. ئەمەش لەخۆیدا تراژیدیایەکی گەورەیە.

### ٥. *ئەو جەنگانەی کە بەرێوەن.*

پێش ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١ ، ئێمە لە قۆناغی یەکەمی گلۆبالیزاسیۆندا بووین. لەم قۆناغەداو لەگەڵ شۆرشی تەکنۆلۆژیای نوێدا، دیالۆگێکی بەردەوامیش لەسەر فرە-کولتوریی و گوێگرتن

لەویتر و پێکەوە ژیان و لەیەکترتێگەشتن هەبوو. سەردەمی بیل کلینتۆن، سەردەمێکی بەهێزی ئەم ئاراستەیە بوو. بەڵام لەگەڵ سەرکەوتنی سەرۆک بوش و گەیشتنی کۆنسێرڤاتۆرە نوێیەکان بە کۆشکی سپی و روودانی ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١، ئیتر یاساکانی یارییەکە گۆڕان. لەم قۆناغەی گلۆبالیزاسیۆندا زۆر بەکەمیی قسە لەسەر دونیای فرە-کولتور دەکرێت. پەیوەندییش لەگەڵ ئەویتردا لەسەر بناغەی گوێ لەیەکگرتن و لەیەکەتێگەشتن دانامەزرێت. لەم قۆناغەدا، ئیتر کۆشکی سپی نایەوێت ئەو دێڕانەی کە لەسەر جیاوازیی نێوان مۆدێلی رۆژئاوایی و مۆدێلی ئیسلامیی نووسراون، بخوێنێتەوە. بەپێچەوانەوە، ئەوەی لەم قۆناغەدا گرنگیی پێدەدرێت کوشتنی جیاوازییەکانە، لێدانی دەهۆڵی جەنگە، بڵاوبوونەوەی تارماییەکانە. ئێستا کە لە پاریس سواری میترۆ دەبین، بیر ەوەدەکەینەوە کە ئاخۆ دوای چەند چرکەیەکیتر ئێمە مردووین یان نا؟

جەنگی بەردەوامی نێوان ئیسرائیل-فەلەستین، لافاوی خوێن لە عێراقی پاش سەدام، تەقینەوە یەک لەدوای یەکەکانی لوبنان، ەقینەوەکانی مەدرید، لەندەن، خۆئامادەکردنی رۆژانەی پاریس بۆ پاراستنی میترۆکان لە تەقینەوە، هتد، ئەو هەستەمان لا دروستدەکەن کە ئیتر ژیانێکی ئاسودەو ئارام لەم گەردوونە نوێیەدا زۆر ئەستەمە. ەم گەردوونەدا گۆڕانکارییەکان زۆر بە پەلە دێن و شتەکان دەگۆڕن. ە هەرەسی دیواری بەرلینەوە تا ١١ي سێپتەمبەر زۆر شت گۆڕان، ـە ١١ي سێپتەمبەریشەوە تائێستا گۆڕانکارییەکی گەورە دەبینین. گەورەترین مانیفێستی ئەم قۆناغە، بریتییە لە بەجێهێشتنی کۆمەڵگەی ـەدەنیی و پێخستنە نێو کۆمەڵگەی سەربازییەوە. هەست بەوەدەکەین کە ئیتر جیهان یەک کۆمەڵگەی سەربازییە و ئێمەش هەموومان سەربازین. بۆ هەرکوێیەک دەرۆین سەربازەکان و پۆلیسەکان و

دەزگاکانی موخابەرات لەپێشمانەوەن. پەرلەمانی وڵاتانی رۆژئاوا، هەر رۆژەو یاسایەک لەسەر جەنگ و تیرۆریسم بەرهەمدێنن.
ئەم گوزەرە، گوزەر لە کۆمەڵگەی مەدەنییەوە بەرەو کۆمەڵگەی جەنگ، لای ئیسلامیستەکانیش زۆر بەڕوونیی هەستی پێدەکرێت. ئیسلامیستەکان، دوای ئەوەی کە پرۆژە سیاسییەکەیان بریتیبوو لە دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامیی، شکستی هێنا. ئێستا بەوپەڕی زەبروزەنگەوە پەلاماری جیهان دەدەن و دەیانەوێت بیکەن بەدۆزەخی جەنگ. مەگەر ئەو تیرۆریستەی کە لە میترۆکانی لەندەندا خۆی تەقاندەوە، لەسەر کەناڵی الجزیرة و لە وەسیتنامەکەیدا نەیگووت: ئێمە لەجەنگداین و منیش هیچنیم سەربازێک نەبێت. مەگەر ئەوانەی هێرشەکانی ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١ یان ئەنجامدا، پاشماوەکانی شکستی پرۆژەی ئیسلامی سیاسیی نەبوون!
لە ئەمرۆدا، بەقەدەر ئەوەندەی سەرۆک بوش لەوپەڕی دونیا بەدوای تیرۆریستاندا دەگەرێت، بۆ ئەوەی لەناویانببات و گوررزی کاریگەریان لێبووەشێنێت، تیرۆریستانیش هەوڵدەدەن هەمان جەنگ بگوێزنەوە نێو فرۆکەخانە و مێترۆ و وێستگەی شەمەندەفەرەکان.
لێرەوە هەست بەوەدەکەین، وردە وردە، لۆژیکی کۆمەڵایەتیی و ژیانی کۆمەڵایەتیی هەڵدەوەشێتەوە. وەک خەساندن دەخەسێنرێت تا رادەی بێمانابوون. ئیتر گرفتەکانی رۆژانەمان راستەوخۆ پەیوەند دەبنەوە بە رووداوە جیهانییەکانەوەو ئەوەی پراکتیکی رۆژانەمان دەبات بەرێوەو ئەوەی سەرکردایەتییمان دەکات، بەتەنها ئێرە نیە، بەڵکو هەموو جیهانە.
لەبەر رۆشنایی ئەم هەموو گۆڕانکارییانەدا، هەست بەوەدەکەین کە، هێدی هێدی، مرۆڤەکان ئیتر وەک (کائینێکی کۆمەڵایەتیی) خۆیان پێناسەناکەن! کوا ئێستا وەک جاران قسە لەسەر گرفتەکانی کار و ژیانی پیشەیی دەکەین؟ مەگەر نیکۆلا سەرکۆزی، وەزیری ناوخۆی

ئێستای فەرەنسا، لەڕێگای چارەسەرکردنی مەسەلەکانی ئاسایشەوە نییە کە دەیەوێت ببێت بە سەرۆک کۆماری داهاتوو لە کۆشکی ئەلیزێ؟

هەر لە پاریسەوە تا واشنتۆن، هەر لە لەندەنەوە تا بەرلین، هەر لە قاهیرەوە تا سلێمانی، هەر لە دیمەشقەوە تا تاران، کێ هەیە لە چاوەڕوانی جەنگدا نەژی؟ جەنگێک کە ڕەنگە لەم چرکەیەدا ڕووبدات و هەزاران کەس ببن بە قوربانیی؟

## ١. کۆتایی.

ئایا هەموو ئەم ڕووداوانە دەمانگەیەنێتە ئەو ئاستەی کە بڵێین: بەڵێ ێمە لەسەردەمی جەنگی شارستانیەتەکاندا دەژین؟ ئایا بەراستیی ئەم ـەردەمە سەردەمی تیۆری جەنگی شارستانیەتەکانی سامویل ونتینگتۆنە؟ ئایا ئەوەی ئێستا لەجەنگدایە شارستانیەتی ڕۆژئاواو یسلامە ؟ ئایا سەرۆک بوش نوێنەرایەتیی شارستانیەتی ڕۆژئاواو وسامە بن لادن نوێنەرایەتی شارستانیەتی ئیسلامیی دەکات؟ ئایا ستێکمان هەیە بەناوی شارستانیەتی ڕۆژئاواو ئیسلامەوە؟

سۆراخکردن و لێکۆڵینەوە لەم پرسیارانە، بە بۆچوونی من، ئەرکێکی ـەورەو بەرپرسیاریەتێکی گرنگە. بەراستیی بەشێکی زۆر لەو ووسینانەی کە ئەمڕۆ بەکوردی لەسەر ئەم مەسەلە حەساسە ووسراون، زیاتر نووسینی ئایدۆلۆژین و بۆ لایەنگیریی و دژایەتیی ووسراون. من پێموایە نووسینی ئایدۆلۆژیی بێهودەیە، چونکە توانێت زانیارییەکی بێلایەنمان بۆ بەرهەمبێنێت. وەک پییەر بۆردیۆ ەیگووت: مومکیننییە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن ڕەخنە لە خودی ەلەفزیۆن بگیرێت. بەهەمانشێوەش دەکرێت بڵێین: مومکیننییە کە

ئایدۆلۆژیای نووسەرێک فێری ئەوەبکات ڕەخنەی لێبگرێت، یاخود زانیارییەکی بێلایەنی لەسەر بەرهەمبهێنێت.

لەبەر ئەم هۆیانەو زۆر هۆی دیکەش، من بەشی داهاتووی ئەم توێژینەوەیەم بۆ بەدواداچوون و سۆراخکردنێکی دوور لە لۆژیکی دۆست و دژی ئەم پرسیارانە تەرخانکردووەو ئومێددەکەم توانیبێتم زانیارییەکی بێلایەن بدەمە دەست خوێنەرانم.

## بەشی سێیەم

## ئایا ئێمە لە سەردەمی جەنگی شارستانیەتەکاندا دەژین؟

"هەموو ئەوانەی کە بەدوای شووناس یان یەکێتی ئیتنییدا دەگەڕێن، پێویستیان بە دوژمن هەیە... ئێمە ناتوانین هاوڕێی راستەقینەمان هەبێت گەر دوژمنی راستەقینەمان نەبێت."

**سامۆیل هونتیگتۆن**

١. *سەرەتا.*

هەر لە واشنتۆنەوە تا هەڵەبجە، هەر لە رۆژنامەی« Le Monde » تا رۆژنامەی هاوڵاتی، ئەمرۆ سامۆیل هونتیگتۆن وەک دیاردەیەک-فینۆمینێک تەماشادەکرێت. سامۆیل هونتیگتۆن ئەمرۆ ئەکتەری پلەیەکی هەموو میدیاکانە. بەقەدەر « Fox News » لەسەر الجزیرة جێگای مشتومڕو قسەلەسەر کردنە. سالی 1996 کتێبە بەناوبانگەکەی بەناوی " شۆکی شارستانیەتەکان"ەوە بلاودەکاتەوە. و لە 1997دا وەردەگێردرێتە سەر زمانی فەرەنسی. دیارە خوێندنەوەی من لەسەر تەرجەمە فەرەنسییەکەیەو دەقەکانی سامۆیل هونتیگتۆنم لە فەرەنسییەوە وەرگێراوەتە سەر زمانی کوردی. من ئاگادارم لەوەی کە بەشێکی زۆر لە خوێنەرانی کورد، لە رێگای زمانی عەرەبی یان فارسییەوە، سامۆیل هونتیگتۆنیان خوێندووەتەوە. ئومێددەکەم ئەم مەسافەی زمانە گرفت بۆ تێگەشتنمان دروست نەکات.

سامۆیل هونتیگتۆن پۆلیتۆلۆگ و پرۆفیسۆر لە زانکۆی هارڤارد، یەکێکە لە بەرپرسانی گۆڤاری « Foreign Affairs ». زۆربەی ئەو

گەورە ئەکتەرە ئەمەریکییانەی کە گرنگیی بە کاروباري دەرەوە دەدەن، لەم گۆڤارەدا نووسینەکانیان بڵاودەکەنەوە. لەوەزارەتی دەرەوەشدا چەندین بەرپرسیاریێتیی لەئەستۆگرتووە.

لەسەر ئاستی جیهان، تێزەکانی ساموێل هونتیگتۆن کاردانەوەی بەردەوام بەرهەمدەهێنن. زۆرجار وەک تیۆری جەنگ و پینەکردنی جەنگ و وتنەوەی وانەکانی جەنگ دەخوێنرێنەوە. تەواو بەپێچەوانەی فرانسیس فۆکۆیاماوە، کە بانگی بۆ کۆتایی مێژوو دەدا، ساموێل هونتیگتۆن کلیک لەسەر دۆسیەکانی ململانێ و زەبروزەنگ و کرانەوەی دونیا بەسەر بەریەککەوتندا دەکات[٢٥].

لەدوای بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی ساموێل هونتیگتۆن، زۆر ئەستەمە بتوانین ئەو کتێبانەی لەسەر جەنگی شارستانیەتەکان نووسراون و ئەو کۆنفرانسانەی گیراون و ئەو دیالۆگانەی کراون و ئەو بەرنامانەی لە تەلەفزیۆنەکاندا پێشکەشکراون، بژمێرین. ئیتر لێرە بەدواوە کێڵگەیەکی دیکەی توێژینەوە دروستدەبێت. کێڵگەی کولتورو پەیوەندییە جیهانییەکان و ئاین و جەنگ و ئاشتیی و تیرۆریسم و، هتد.

تێبینی: لەکوردوستان، هەردوو وشەی شارستانیەت و ژیار لەبەرامبەر « Civilisation » فەرەنسیدا دادەنرێت. هەندێ نووسەر ژیار بەکاردەهێنن و هەندێک شارستانیەت. سیڤیلیزاسیۆن هەرکامیانبێت بۆمن (لێرەدا) گرنگنییە. گرنگ ئەوەیە خوێنەر بزانێت من شارستانیەت لەبەرامبەر « Civilisation »دا بەکاردەهێنم. خوێنەر گەر ویستی دەتوانێت لەبری شارستانیەت تێرمی ژیار دابنێت و ئەوکارە هیچ لە ناوەرۆکی باسەکەی من ناگۆڕێت.

### ٢. ناساندنی تیۆری جەنگی شارستانیەتەکان.

شووناسی دونیای پاش جەنگی سارد، یەکێک لە تەوەرە هەرەگرنگەکانی تیۆرییەکەی سامۆیل هونتیگتۆن پێکدەهێنێت. ئەو بەمجۆرە لەم شووناسە دەدوێت:

"لەکۆتایی جەنگی ساردەوە تائێستا، چۆنیەتی پێناسەکردنی شووناس و بەسامبۆلکردنی، لای گەلان تەواو گۆڕاوە. سیاسەتی گشتییش، لەوکاتەوە تائێستا، زیاتر لەسەر بنەما کولتورییەکان دادەڕێژرێت... هەموو ئەوانەی کە بەدوای شووناس یان یەکێتی ئێتنییدا دەگەڕێن پێویستیان بە دوژمن هەیە... ئێمە ناتوانین هاوڕێی راستەقینەمان هەبێت گەر دوژمنی راستەقینەمان نەبێت... ململانێی هەرە مەترسیدارەکانی ئەمڕۆ هەڵقوڵاوی ئەو هێڵە سەرەکییانەن کە شارستانیەتە گەورەکان لەیەکتر جودادەکاتەوە."[٢٦]

سامۆیل هونتیگتۆن بەمشێوەیە لە سەردەمی ئاوابوونی خۆری ئایدۆلۆژی و چوونە نێو دونیای کولتورەکانەوە دەدوێت:

"لە ئەمڕۆدا ئیتر جیاوازییە گەورەکانی نێوان گەلان بریتینییە لە جیاوازییە ئایدۆلۆژیی و سیاسیی و ئابوورییەکان، بەڵکو بریتییە لە جیاوازییە کولتورییەکان... لە ئێستادا گەلان لە ڕوانگەی ئاین و زمان و مێژوو بەهاو تەقالیدو دەزگاکانەوە خۆیان پێناسەدەکەن..." ( لاپەڕە 16).

بەپێی سامۆیل هونتیگتۆن، ئیتر دونیا بەسەر دوو بلۆکدا دابەشنابێت، بەڵکو بەسەر ئەم شارستانیەتانەدا دابەشدەبێت: شارستانیەتی رۆژئاوا، لاتنیۆ-ئەمەریکی، ئەفریقی، ئیسلامیی، چینی، هیندی، بوودی، ژاپۆنی، هتد. ( لاپەڕە 16.) سامۆیل هونتیگتۆن، تەواو بە پێچەوانەی فۆکۆیاماوە، پێماندەڵێت کە جیهانی پاش جەنگی سارد جیهانی یەک جەمسەرو یەک ئیمپراتۆریەت و جیهانی کۆتایی مێژوو نییە، بەڵکو جیهانی فرە شارستانیەت و فرە جەمسەرە. لێرەوە چەمکی کۆمەڵگەی جیهانیی یان شارستانیەتی جیهانیی رەتدەکاتەوە:

**"مۆدێرنیزاسیۆن تەواو خۆی لە بەرۆژئاواییبوون-ئۆکسیدانتالیزاسیۆن جیادەکاتەوەو ئیتر بەهیچ شێوەیەک توانای بەرهەمهێنانی شارستانیەتێکی جیهانیی نییە، هەروەها توانای بەرۆژئاواییکردنی کۆمەڵگە نارۆژئاواییەکانی نییە"( لاپەڕە 16).**

لەسەر گەشەسەندنی شارستانیەتەکانی دیکەو سنوردانان بۆ شارستانیەتی رۆژئاوایی، بەمشێوەیە دەدوێت:

**"پەیوەندییەکانی هێز لە نێوان شارستانیەتەکاندا گۆڕاون و وەک جاران نەماون. کارایی رۆژئاوا لەکەمبوونەوەدایە. هێزی ئابووریی و سەربازیی و سیاسیی چین لە نەشونماکردندایە ؛ ئیسلام لەسەر ئاستی دیمۆگرافی دەتەقێتەوەو ولاتانی ئیسلامیی و دروسی دەخاتە بارودۆخێکی ناجێگیرەوە؛ شارستانیەتەکانی نارۆژئاوایی کلیک لەسەر بەهاکانیان دەکەن" ( لاپەڕە 20).**

نووسەر پێیوایە کە هەنووکە سیستێمی نوێی جیهانیی بەشێوەیەکی
ـیکە خۆی دادەڕێژێتەوە. لە ئێستادا ئەم سیستێمە بەرهەمی ئەو هێڵە
گەورانەیە کە ڕێگا نادات شارستانیەتەکان تێکەڵبەیەکتربن:

**" سیستێمێکی جیهانیی کە لەسەر بنەمای شارستانیەتەکان دروستبووە، جوانتر دەردەکەوێت" ( لاپەڕە 17).**

دەرەنجامی ئەم بارودۆخەش، بەپێی سامۆیل هونتیگتۆن، بریتینییە
ـە پێکەوە ژیانێکی دۆستانەو دیموکراتییانە، بە پێچەوانەوە، ئەم
ارودۆخە لەسەر ئاستی لۆکال و گلۆبال شارستانیەتەکان بەرەو
ـەنگ دەبەن. کێ هەیە لە ئێمە جەنگی نێوان موسوڵمانان لەگەڵ نا-
وسوڵماندا ڕۆژانە تێبینی نەکات؟ لێرەوە، سامۆیل پێیوایە کە ڕەنگە
ـەدەی بیست و یەک سەدەی جەنگە گەورەکان بێت. جەنگی
ـارستانیەتەکان:

**" لە ئێستادا دینامیکیەتی ئیسلام سەرچاوەی چەندین جەنگی بچوکی شارستانییە. بەرەو سەرەوە کشانی چین ڕەنگە لە داهاتویەکی نزیکدا زەمینە بۆ چەندین جەنگی شارستانیی گەورە خۆشبکات" ( لاپەڕە 229).**

ـەو پێیوایە وەهمی خۆ-بەجیهانزانین لای ڕۆژئاواییەکان
ـشدارییەکی بەهێزی لە جەنگەکانی ئێستا و داهاتوودا هەیە.
تایبەتی لەگەڵ ئیسلام و چین دا:

**" ڕۆژئاواییەکان دەبێت لەوە تێبگەن کە شارستانیەتەکەیان تاقانەیە، بەڵام جیهانیی نییە، دەبێت زیاتر باوەشبەیەکتردابکەن بۆ ئەوەی بتوانن پێکەوە ڕووبەڕووی ئەو**

**تەحەدایانە ببنەوە کە لەدەرەوە دێت و هەرەشەیان لێدەکات" ( لاپەرە 17).**

نووسەر رۆژئاوا دەخاتە بەردەم هەموو ئەو مەترسییانەی کە لە هەردوو دوونیای ئیسلام و چینەوە دێت و هەرەشەی راستەقینە لە شارستانیەتی رۆژئاوا دەکەن. ئەو بەتوندیی هەموو ئەو تێزانە رەتدەکاتەوە کە دەیانەوێت پێمانبڵێن:

> **" رۆژئاوا لەگەڵ ئیسلامدا گرفتی نییە، بەڵکو گرفتی لەگەڵ ئیسلامییە توندڕەوەکاندا هەیە. 1400 ساڵی مێژووی ئیسلام ئەم تێزە بەدرۆدەخەنەوە. پەیوەندیی نێوان ئیسلام و کریستیانیسمیش هەمیشە لەهەڵچووندابووەو هەریەکەیان ئەویتر بووە بۆ بەرامبەرەکەی " (لاپەرە 17).**

ساموێل هونتیگتۆن پێیوایە کە هۆکارەکانی ئەم بەریەککەوتن ا لەیەکدانە دەگەرێتەوە بۆ خودی سروشتی هەردوو شارستانیەت، ک لەسەر ئیسلام و کریستیانیسم درووستبوون. ئەم ململانێیە یەکێکە ل بەرهەمەکانی جیاوازییەکانیان و بەبێ ململانێ توانای مانەوەیان نییا بەتایبەتی ئیسلام، کە خۆی بە کۆتا ئاینی بەشەریەت دەزانێت پێیوایە بەرپرسیارە لە یەکخستنی تەواوی گەلان و نەتەوەکانی دونیا.

### ٣. *بارکردنی شارستانیەت لە ئایدۆلۆژیای جەنگ.*

ئێمە بۆ ئەوەی بتوانین گوفتوگۆیەکی جدیی لەگەڵ ساموێ هونتیگتۆن دا بکەین، هەر لەسەرەتاوە پێویستمان بە تێگەیشتن زانیارییەکی بارنەکراو لە ئایدۆلۆژیا لەسەر شارستانیەت هەیە. بۆی

مـن پێـشنیازی ئـەوەدەکـەم کـە لـەم پرسـیارەوە دەسـتپێبکەبـن:
شارستانیەت چییە؟

بێگومان دەستەواژەی شارستانیەت خاوەنی مێژوویەکەو بەچەندین ڕاڕەوی بیناکردندا تێپەڕیوە. گەورە مێژونووسی فەرەنسی لوسیان فێبڤر (1878-1956)، لەکتێبە بەناوبانگەکەیدا (بۆ مێژوویەکی کامڵ) بەمشێوەیە لەم وشەیە دەدوێت:

**"مێـژووی وشـەی (سیڤیلیزاسـیۆن- شارسـتانیەت) لـە زمـانی فـەرەنـسیدا پـەیـوەندییـەکی ڕاسـتەوخـۆی بـە قوڵایی شۆڕشـەکانی سـەدەی هـەژدەهـەمـەوە تـا ڕۆژی ئەمڕۆمان هەیە".[٢٧٠]**

لەراستییدا گەشەکردن و فراوانبوونی ئاسۆی ماناکانی ئەم وشەیە، بەجۆرێک لە جۆرەکان، لکاوە بە مێژووی سەردەمی ڕۆشنگەریی و پێشکەوتنـەوەو بـەئـەنـدازەی دورکـەوتنـەوەی مـرۆڤ لـە بـاوەشـی سروشـت، شارسـتانیەت خـۆی مانیفێستدەکـات. واتـە شارسـتانیەت دەرئەنجامی مێژوویەکی درێژی یاخیبوونە لە هەیمەنەی سروشت.

لـە زمـانی فـەرەنسیدا، ئـەم وشـەیـە لـەسـەر ئاسـتی ئێتیمۆلـۆژی دەمانباتـەوە سـەر « Cité » شـار . شـار لـە بـەرامبـەر لادێـدا. شارستانی لە بەرامبەر بەربەریەتدا. شار، شارەوانیی، شارکردن، تا دەگەینە شارستانیەت.

کلۆد لیۆزو، لە کتێبی (ئیمپراتۆریەتی شەڕ دژی شەیتانی گەورە) دا دەڵێت:

**"لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهـەمـەوە، ئیتر شارسـتانیەت بـەجـەمـع دەبینرێت نـەک بـە موفرەد. لە سەدەی نۆزدەهـەمـەوە، فرەیی کولتـورەکـان و لـەیـەکنـەچوونیـان وەک**

رەتکردنەوەی یەک مانا و یەک ڕێگا خۆیان پێشنیازدەکرد. فیعلی civiliser-شارستانی لە کاتی داگیرکردنی جەزائیرەوە دێتەنێو زمانی فەرەنسیەوە. و بەناوەی ئەم بالآبوونەوە ژول فێری بەهانە بۆ ئامپریالیسم دەهێنێتەوەو پێماندەڵێت ئەرکی سەرشانمانە شارستانیەت بگەیەنینە ئەو جێگایانەی کە دوورن لەشارستانیەت"[٢٨٠].

لە زمانی عەرەبیدا وشەی " ألحضارة" تەواو لە بەکارهێناندا لە مانا فەرەنسییەکەیەوە نزیکە. وەک فەرەنسییەکان و عەرەبەکانیش "ألحضارة" لە بەرامبەر ژیانی لادێدا دادەنێن و لە رووی ئێتیمۆلۆژییەوە دەمانباتەوە سەر شار و شارەوانیی و ئاوەدانیی و تەمەدون.

پێشئەوەی بگەرێمەوە سەر سامۆیل هونتیگتۆن، پێمباشە بگەرێینەوە سەر دوو گەورە زانای کە لەسەر فینۆمێنی شارستانیەت بەدەنگهاتوون و بەشداریی جدییان لە پێناسەکردنیدا کردووە. ئەو دوو زانایە بریتین لە ئێمیل دۆرکایم (1917 - 1858) یەکێک لەباوکەکانی سۆسیۆلۆژیا و ئیدوارد بورنێت تیلۆر (1917 - 1832) ئەنترۆپۆلۆگی بەریتانی. دۆرکایم دەڵێت:

" پیاوانی دەوڵەت، فەیلەسوفەکان، جەماوەر، بەردەوام لەسەر شارستانیەت قسەدەکەن. لە زەمەنی ناسیۆنالیستەکاندا، شارستانیەت بریتییە لە کولتووری نەتەوەکەیان، چوونکە ناسیۆنالیستەکان بۆ دەرخستنی خۆیان شارستانیەتی ئەوانیدیکە رەفزدەکەن. بەڵام لە زەمەنی

راسیۆنالیستەکاندا (عەقڵگەراکاندا)
شارستانیەت سیمایەکی جیهانیی و کۆسمۆپۆلیتی هەیە. لەم زەمەندا شارستانیەت لە یەککاتدا لە کۆمەڵێک شتی ئیدیال و واقیعی، عەقڵانیی و سروشتی، سەبەبی و غائی پێکدێت... لەراستییدا نەشونماکردن و پێشکەوتنی مرۆڤەکان هەرگیز بەوشێوەیە نییە کە ریزێک لەکۆمەڵگە هەبێت و یەکێک لە پێشەوە بێت و ئەویدیکە لەدواوە بێت(واتە بەپێی پێشکەوتن و دواکەوتنیان لەریزدابن)؛ بەپێچەوانەوە کاروانی پێشکەوتنی مرۆڤەکان زیاتر لە درەختێک دەچێت کە هەڵگری چەندین چڵ و گەڵایە نەک یەک چڵ و یەک گەڵا"[٢٩٠].

دۆرکایم لێرەدا لەیەککاتدا روانینی ناسیۆنالیستەکان وەک روانینی جەنگ بۆ شارستانیەت دەخاتەروو. پێیوایە ناسیۆنالیستەکان لەهەرکوێبن پرۆژەی جەنگێکی بەردەوامن، چونکە ئەوان بوونی خۆیان لە لێدانی ئەویدیکەدا دەبیننەوە. لەهەمانکاتدا ئەو شارستانیەت وەک هێڵێکی درێژ نابینێت، هێڵێک کە کۆمەڵگەکان بەپێی ئاستی دواکەوتن و پێشکەوتنیان سەریان گرتبێت. ئەو پێیوایە کە شارستانیەت سەرەنجامی کۆی تێکۆشانی هەموو مرۆڤەکانە و هەموو پێکەوە تیایدا بەشدارن. ئیدوارد بورنێت تیلۆر، لە پێناسەی شارستانیەتدا، بەمشێوەیە دەدوێت:

"شارستانیەت بریتییە لەو یەکە ئاڵۆزەی کە پێکهاتووە لە مەعریفە، عەقائید، هونەر،

### ئەخلاق، ماف، عادات و تەقالیدی مرۆڤ
### وەک ئەندامی کۆمەڵگەیەک"[30].

لەم پێناسەیەدا تیلۆر دەیەوێت ئەو مانایە بخاتە سەر ئەو کە گردبوونەوەی مرۆڤەکان لەدەوری یەکتر بە ئەندامەکانی دەبەخشێت. واتە ئەو باس لە مەوقیعی تاک لە نێو گروپێکدا دەکات. مەوقیعێک کە دەکرێت وەک سەرچاوەی ماناکانی ژیان بۆ هەر تاکێک تەماشابکرێت. لەرێگای مەوقیعەوە، کۆمەڵگە بەردەوام مەعریفەی رێکخستن و بەهاو ئاین و زمان و بیرکردنەوە و چۆنیەتی ژیان دەداتە دەست ئەندامەکانی، بۆ ئەوەی بتوانن بمێننەوە. بەبێئەوەی یەک چرکەش ئەوەمان لەبیربچێت کە تەنانەت خودی کۆمەڵگەش پێشینەیەکی ئەزەلیی نییەو بە بەردەوامیی لەنێو کردەی بیناکردندایە. واتە ئەوە ئەندامانی هەر کۆمەڵگەیەکن کە لەنێو ئێستاو ئێرەکانیاندا کۆی رێکخستن و بەهاو ئاین و ئەخلاق و زمانیان بینادەکەن و دەیانخەنەگەڕ، نەک بە پێچەوانەوە.

یەکێک لە گرفتە هەرە گەورەکانی سامۆیل هونتیگتۆن لێرەدایە. ئەو نایەوێت تەحلیلێکی سۆسیۆلۆژیانەی شارستانیەت و کۆمەڵگەو کردەی بیناکردن بکات. نایەوێت ئەو پرۆسێسیوسە بەهێزەی دانوستانی ئەکتەرەکان بۆ بیانکردنی شووناس و خود و ژیان و کۆمەڵگە ببینێت. نایەوێت لەوە تێبگات کە چۆن تاکەکان وەک فاعیلی کۆمەڵایەتیی هەموو چرکەیەک لە چرکەکانی ژیان دەخەنە نێو پرۆسێسیوسی موفاوەزاتەوە. تەنانەت بەها و ئەخلاق و رێکخستنی کۆمەڵایەتیی و تەنانەت عەقائیدیش. ژان کلۆد کۆفمان، سۆسیۆلۆگی بەناوبانگ و پرۆفیسۆر لە زانکۆی سۆربۆن، لە دوا کتێبیدا بەناوی (تێۆری شووناس: خولقاندنی خود)دا کە دەرئەنجامی توێژینەوەیەکی مەیدانیی دوو ساڵییە، کۆی ئەو پرۆسێسیوسەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە لە رێگایەوە تاک و گروپەکان شووناسی پێ بینادەکەن[31]. تەواو بەپێچەوانەی ژان کلۆد کۆفمانەوە، سامۆیل هونتیگتۆن پێیوایە کە شووناس ماڵێکی داخراوەو واقیعێکی نەگۆڕاو جێگیرەو خۆی

ەسەپێنێت بەسەر تاک و گروپەکانداو ناچاری ململانێ و جەنگ و ەریەککەوتنیان دەکات.

"جیاوازییە گەورەکانی نێو پێشکەوتنی سیاسیی و ئابووریی ڕەگوڕیشەکانی لە نێو جیاوازییە کولتورییەکاندا دەدۆزینەوە. سەرکەوتنە بەهێزە ئابوورییەکانی رۆژهەلاتی دوور لە کولتوری ئاسیاییەوە سەرچاوەدەگرێت. هەروەها نەبوونی سیستێمێکی سیاسیی دیموکراسیی لەم کۆمەلگایانەدا بۆ هەمان هۆکار دەگەڕێتەوە. بەهەمانشێوە، شکستی دیمۆکراسیی لە جیهانی ئیسلامییدا ڕەگوڕیشەکانی لە کولتوری ئیسلامییدا دەبینینەوە"[٢٢].

بێگومان ئەمە یەکێکە لەو هەڵە مێتۆدییانەی کە نووسەر نایەوێت ـی دەربازببێت. ئەو باس لە کولتوری ئیسلامیی و ئاسیایی و ۆژئاوایی وەک بوونیەکارو وەک رێکخستنی رێکخەرو ەک نۆرمی نۆرمدروستکار دەکات. ئەو پێیوایە ئەوەی موسوڵمانان روستدەکات کولتوری ئیسلامییە، لەکاتێکدا پێچەوانەکەی تەواو استەو ئەوەی کولتوری ئیسلامیی دروستدەکات موسوڵمانان خۆیان. ـن پێموایە، ئێمە هەڵەیەکی مێتۆدیلۆژیی دەکەین، گەر لە قورئان و ەرموودەکانی پێغەمبەردا بۆ شکستی دیمۆکراسیی لەنێو جیهانی ـسلامییدا بگەرێین، چونکە ئەوەی دیمۆکراسیی و پێشکەوتن و واکەوتن و زەبروزەنگ و پێکەوەژیان دروستدەکات، دەقەکانی

قورئـان نـین، بـەڵکـو پراکتیکـی موسـوڵمانانە. لـە جیهـانی ئیـسلامدا دەکریـت یـەککگرتـووی ئیـسلامیی کـە لـەسـەر ئاسـتی پراکتیـک مومـارەسـەی پلوریالیـسم و هـەڵبـژاردن و بـەرەدروسـتکردن لـەگـەڵ حیزبی نا ئیسلامیی و چوونـە نێو حکومـەتی نائیسلامیی و هـەروەهـا مومـــارەســەی ئیـسلامێکی تـــەواو دیموکراتخـــوازدەکـــات، ببینـــین و ئەنساری ئیسلامییش ببینین کە بەچەقۆی کول سەری بەشەر دەبڕن. ئەوە دەقەکانی قورئـان نییـە کە ئـەنسار و یـەککگرتـوو دروسـتدەکات، بەڵکو ئەوە پراکتیکی ئەنسارو یەککگرتووە کە ئیسلام دروستدەکات. ئێمـە چ هـەڵـەیـەکـی مێتۆدۆلـۆژیی دەکـەیـن گـەر پێمانوابێت ئیسلامی یەککگرتوو هەمان ئیسلامی ئەنسارە. رەنگە هەندێک بیانەوێت بەنـاوی جەنگی سیاسییەوە ئەم کارە بکەن، بەڵام ئـەم هـەڵـەیە لـەسـەر ئاسـتی زانست دەبێت وەک کوفر تەماشابکرێت. راسـتە ئـەنـسـار و یـەککگرتـوو باوەریان بەیەک خوا هـەیە، بـەڵام ئایا ئـەم خوایە، لـەژیانی رۆژانـەی یـەککگرتوویەکدا تـەواو جیـاوازە لـەو خوایـەی کـە لـەژیـانی رۆژانـەی ئەنسارێکدا هـەیە؟ ئـەو خوایـەی کـە یـەککگرتوویەک بـەرەو پـەرلـەمان هاندەدات و فێری دیموکراسیەتـی دەکـات و وانـەکـانی پێکـەوە ژیـان لـەگـەڵ نائیـسلامییەکانـدا پێدەڵێتـەوە، هـەرگیـز ئـەو خوایـە نییـە کـە ئەنسارێک لە رۆژی جەژندا دەنێرێتە شوێنە گشتییەکانـەوە بـۆ ئـەوەی خۆی بتەقێنێتەوەو ژن و منالّ و گەورەو بچوک پێکەوە بکوژێت.

لـە رێگـای ئـەو تێزانـەی کـە سـامۆیل هونتیگتـۆن پێشنیازیاندەکات، دەیەوێت ئیمانمان پێبێنێت کە لەنێوان کولتورو سروشتدا دیوار نییە. واتـە کولتـور وەک بارانبـارین و بـەفربـارین و ئاوخواردنـەوە هـەواو لـــەرزینـــی زەوی... وایـــە. وەک چـــۆن ئێمـــە نـــاتوانین دەســـتکاریی سروشـتبکەیـن، ئـاواش لـەبـەرامبـەر کولتـوردا بێـدەسـەڵاتین. ئێمـە هــەمووومـــان هیچنـین، منـدالانی کوولتـورەکانمـان نـەبێـت. تـەواو بەپێچەوانەی تێزەکانی سامۆیل هونتیگتۆنەوە، تورکیا کە مێژوویەکـی

ـرێژی لـەگـەڵ کولتوری ئیسلامییدا هـەیـە، ئـەوەنـدی هـەوڵـدەدات لـە
ـەورووپا نزیکبێتـەوە، نیـو ئـەوەنـدە هـەوڵـنادات لـە ئێرانـی ئیسلامیی
ـیکبێتـەوە. پـەیوەنـدیی نێوان وڵاتـانی ئیسلامیی و وڵاتـانی عـەرەبـی
ـر لەوە لاوازترو بێپیتترو کاڵترەو تا لەنێو یەک کولتوری ئیسلامیی
یەک شارستانیەتی ئیسلامییدا کۆیان بکەینەوە. سامۆیل هونتیگتۆن
ـەوێت چاوێک بـەمێژووی نزیکی جیهانی ئیسلامییدا بخشێنێت، تا
ـنێت دەرەنجامەکانی زیاتر لە خەیاڵێکی فراوانـەوە دێنـەدەرەوە نـەک
زەمینـەیـەکی واقیعیدا. مـەگـەر پێش پـەلامـاردانی عێراق لـەلایـەن
ـمەریکاوە، عێراقی موسـوڵمان پەلاماری ئێرانـی موسـوڵمانی نـەدا؟
ـگەر عێراقی موسوڵمان پەلاماری کوێتی موسوڵمانی نەدا؟ مـەگـەر
ـودیەی موسوڵمان هانای بۆ ئەمەریکا نەبرد بۆ ئـەوەی لـە عێراقی
ـسـولمانی بپارێزێـت؟ مـەگـەر بـە درێژایـی هـەشـتاکان، وڵاتـە
ـسـولمانەکـانی کـەنـداو لـە ئـەمـەریکا نـەدەپاڕانـەوە بۆ ئـەوەی لـە
ـرشی ئیسلامیی ئایەتوولا خومەینی بیانپارێزێت؟ بازدانی سامۆیل
ـنتیگتۆن بـەسـەر ئـەم هـەمـوو ڕووداوە مێژووییانـەدا، بـۆ
ـستکردنی تیۆرییەکی دوور لە مەیدان، بێ میسداقیەت دەمێنێتەوە
ـک دەستنوێژ لەهەموو مانا زانستییەکانی بەتاڵ دەبێتەوە.

### ٤. بیناکردنی کولتوری جەنگ.

ـامۆیل هونتیگتۆن پێیوایـە کـە ئێمـە هـەنووکـە لـە سـەردەمـی
ـگەڕانەوە لە ڕۆژئاواو بەهاکانیدا دەژین. ئەو جەنگەی کە ئێستاش
ـونیادا بە ڕۆژئاوا دەفرۆشرێت، لەبەرئەوەیە کە ڕۆژئاوا دەیەوێت
ـ وەک هەڵگری بەهای جیهانیی پێشنیازبکات. ئەو دەنووسێت:

ئـەوانـەی لـە ڕۆژئـاوا یـاخیبوون،
ڕەگوڕیـشەی یاخیبوونـەکانیـان لـە
دژایەتییکردنی بەجیهانییکردنی بەهاکانی

ڕۆژئاوادا دەبیننەوە. ئەوان لەڕێگای جەنگ و ململانێکانەوە دەیانەوێت بیسەلمێنن کە بەهاکانیان باڵاترن لە بەهاکانی ڕۆژئاوا...هەموو ئەو هەوڵانەی کە ڕۆژئاوا دەیخاتەکار بۆ پێشنیازکردنی کۆنسێپتەکانی وەک *فەردانیەت* و *لیبرالیسم* و *دەوڵەتی ماف*، لای وڵاتانی بەکولتور موسوڵمان و کۆنفیوسێن و هیندۆس و بودیست و ئۆرتۆدۆکس، کاردانەوەی توونـدوتیژ بەرامبەر *ئیمپراتۆریەتی مافەکانی مرۆڤ دروستدەکات* ". (لاپەرە 98)

سامۆیل هونتیگتۆن پێیوایە لەساڵانی هەشتاوە تائێستا، ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیە لە ئارادیە و ئەو وڵاتانە زۆر بە توندیی ڕۆژئاوا ڕەتدەکەنەوە. ئێستا جیهان بریتییە لە زیندانی کلوتورو تەقالیدو عاداتەکان. لە ئێستادا ئیتر مۆدێلێکی کولتوری جیهانیی لەئارادانییە. بەپێچەوانەوە، ئێستا سەرزەوی مەیدانی بەریەککەوتنی هەموو ئەو زیندان و زیندانیانەیە.

لەهەمانکاتدا ڕەخنە ئاراستەی ڕۆژئاوا دەکات و تاوانباری دەکات بە هەرەسی ئەخلاقیی و خودکوژیی کولتوریی و نەبوونی یەک سیاسەت. پێیوایە ئەم گرفتانە زۆر لە گرفتە ئابووریی و دیمۆگرافییەکان گەورەترن. ئەو هەڵوەشانەوەی خێزان لە ڕۆژئاوا بە هەرەشەیەکی گەورە دەزانێت و گرنگیی ئەم کێشەیەی لە ئاست گرنگیی ئاوێزاننەبوونی کۆچەران بە کۆمەڵگەکانی ڕۆژئاوادا دەبینێت. تەنانەت تۆڕێکی پەیوەندیی لەنێوان ئەم دوو کێشەیەدا دروستدەکات و دەڵێت کە کۆچەران نایانەوێت ئاوێزانی کۆمەڵگەکانی ڕۆژئاوا ببن، لەبەر ئەوەیە کە ڕۆژئاوا لە شکستی کۆمەڵایەتییدا دەژی. بۆ سامۆیل

یگتۆن ئەم مەسەلەیە تەواو ترسناکە و گەر کۆچەران ئاوێزان
ن بە شارستانیەتی رۆژئاوا، بێگومان دەبن بە هەرەشەیەکی
ساتاوی لەسەر تەواوی کۆمەڵگەکانی ئەوروپاو ئەمەریکا، چونکە
ڕێگایەوە ئەوان رۆژئاوا دابەشدەکەن بەسەر کۆمەڵێک کولتورو
و کۆمینۆتی و گروپی جیاجیاداو ناگونجاو لەگەڵ یەکتریدا.
رە337).

امۆیل هونتیگتۆن هەموو ئەو رۆشنبیرو سۆسیۆلۆگ و
ەسوفە رۆژئاواییانەی کە باس لە رۆژئاوای فرەکولتور-
کولتور دەکەن، بەهەرەشەیەکی گەورە لەسەر شارستانیەتی
اوا دەزانێت و وەک پرۆژەی جەنگ و لەتکردن و هەڵوەشانەوە
ثایان دەکات.

> "لەسەردەمێکدا کە هەموو گەلان لە ڕێگای ئینتیما کولتورییەکانیانەوە خۆیان پێناسەدەکان و شوناسەکانیان دروستدەکەن، کۆمەڵگەیەک کە قولاییەکی کولتوریی هاوبەشی نەبێت و تەنها لەسەر بنەما سیاسییەکانی راوەستێت، لەکوێدا جێگای دەبێتەوە؟... رەتکردنەوەی پرانسیپە گشتییەکانی شارستانیەتی رۆژئاوایی مانای کۆتاییهاتنە بە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، وەکئەوەی کە تائێستا ناسیومانە. هەروەها مانای کۆتاییهاتن بە خودی شارستانیەتی رۆژئاواش... لەراستییدا داهاتووی ئەمەریکا و رۆژئاوا پەیوەستە بە تازەکەدنەوەی ئیمانیان بە شارستانیەتی رۆژئاوایی".( لاپەرە339).

مـارک کرێپـۆن، سـاڵێک پـاش ١١ي سـێپتەمبـەري٢٠٠١ دوورتـر لـا
سـامۆیل هونتیگتـۆن دەڕوات و بـەتایبـەتی کلیک لـەسـەر پـەیوەندیی
نێوان شارستانیەتـی ئیسلامیی و شـارستانیەتـی رۆژئـاوایی دەکات
ئەوە لە کتێبـەکـەیدا کە تـەرخـانیکردووە بۆ تـەحلیلکردنی پـەیوەندیی
نێوان ئەو دوو جیهانە لە روانگەی ١١ي سێپتەمبەري٢٠٠١ەوە دەڵێت:

" لـەراسـتییدا تـا ئیـسلام وەک ئیـسلام بمێنێتـەوە، کـە حـەتمـەن هـەر وەک خـۆی دەمێنێتـــەوەو تــا رۆژئـــاوا وەک رۆژئـــاوا بمێنێتـــەوە، کـــە دڵنیـــانیم وەک خـــۆی نامێنێتەوە، ئەم ململانێیـەی نێوان هـەردوو گـــەورە شارســـــتانیەت وەک خـــۆی دەمێنێتەوەو دوو شێوەی ژیانی لەیەک جیا سروشـــتی پـــەیـــوەنـــدیی هـــەردوولا دیارییدەکەن. چواردەسەدە لـە پـەیوەندیی نێوان ئیسلام و رۆژئاوا گەواهی لەسەر ئەم خوێندنەوەیە دەدات"[٢٣٠].

١. کۆتایی.

پاش خوێندنەوەی هەر بەشێکی کتێبەکەی سامۆیل هونتیگتۆن، لا
من شتێک وەک قەناعەت دروستدەبێت. قەناعەت بەوەی کە سامۆ
هونتیگتـۆن یـەکێکە لـەو پۆلیتۆلۆگانـەی کـە راستـەوخۆ بـەشـدارن ل
بەرهەمهێنانی جەهلدا لەسەر کۆنسێپتەکانی وەک کولتورو شوناس
ئینتیما و شارستانیەت و ململانێ و بەرژەوەندیی و هتد. جەهلێک ک
تەواو یەکدەگرێتەوە لەگەڵ خواست و ئارەزووی بەشێکی گەورە ا
ستراتیژیەتی میدیاکان و سیاسیی و پیاوانی ئایدۆلۆژیادا. ئەوانـە
لـەپشت سـەرکـەوتـن و ناوبانـگ پـەیداکردن و بردنـەوەی کتێبـەکـە
سامۆیل هونتیگتۆنەوەن، هەموو ئەو میدیا و سیاسیی و حـەماڵانـە

ۆلۆژیان کە دەیانەوێت رۆژئاواو رۆژهەڵات بکەن بە مەیدانی
نگەکانیان و ژیان و ئاسوودەیی غەرقی مووشەک و کردە
کوژییەکانیان بکەن.
متیجانێکی سۆسیۆلۆژیانەی تێزەکانی سامۆیل هونتیگتۆن،
امان پێدەدەن کە پەردە لەسەر ئەم جەهلە لابدەین و واقیع وەک
ەی هەیە ببینین نەک وەک ئەوەی کە دەمانەوێت ببێت. سامۆیل
تیگتۆن پێیوایە کە ڕابردوو وەک یەکەیەکی تەبای هەزمکراو
ێوەیەکی بەردەوام کارایی دادەنێت لەسەر کردەو ستراتیژیەت و
سوکەوت و جۆری بیرکردنەوەو ژیانی هەر تاک و گروپ و
وەیەک. ڕابردوو وەک چوارچێوەیەکی گونجاوی گونجاوکراوی
چاوکار، هەر چرکەیەکی ژیانی هەموو رۆژێکی ئێمەی
رۆڵکردووەو سەرزەوی هیچنییە جگە لە چەند زیندانێک و چەند
دوویەک. بەڵام ئەوەی ئێمە لە توێژینەوە سۆسیۆلۆژییەکانماندا
دەرەنجام پێیگەیشتین، تەواو پێچەوانەیە. پاش ساڵو نیوێک
ردنی مەیدانییم لەسەر ژنە سەرپۆشبەسەرکانی فەرەنسا و پاش
دین چاوپێکەوتن و تێبینی و چاودێرکردنی ئەم ئەکتەرانە لە
ەی پراکتیکدا، پاش تەعبیئەکردنی هەموو توانا
یۆلۆژییەکانمان بۆ خوێندنەوەی ئەو ئەکتەرانە، ئێمە گەیشتینە
دەرەنجامەی کە ژیانی هەموو رۆژێکی تاکەکان و گروپەکان
شێوەیە نارۆن بەرێوە. بەپێچەوانەوە، هەر ئەکتەرو گروپ و
ۆتێیەک هەڵگری چەندین ئامادەباشیی و تواناییەو لەنێو هەر
ۆخ و کۆنتێکستێکدا سەرلەبەری تۆری پەیوەندیی و بەهاو
کانی بەهەنووکەیی (ئەکتیوالیزە) دەکات. ئەم تاک-گروپ-
ۆتێیە هەڵگری (خود-زات)ە بە سیغەی جەمع. واتە ئەم کائینە
دۆلابێکی چەندین چەکمەجەدارەوەو لەنێو هەر چەکمەجەیەکدا
د-زات)ێک لە ئامادەباشییدایە بۆ کارکردن و چاوەڕێی

فەرمانپێکرنە بۆ ئەوەی ببێتە دەنگ. مرۆڤ بۆ هەر سیتیواسیۆنێک
دۆخێک (خود)ێکی ئامادەکراوی هەیە و لەهە
ڕووبەڕووبوونەوەیەکدا چەکمەجەیەکی دۆلابەکەی ڕادەکێشێت
ئەوەی ئەو زاتەی کە لێرەدا دەگونجێت پێشکەشیبکات. بەمشێوە
هەر مرۆڤێک دەکرێت وەک هەڵگری چەندین زات تەماشابکرێت
ئێمە لە جیهانی سۆسیۆلۆژیادا ئەم کائینە ناودەنێین: مرۆڤی پلوریا
جەمع. لێرەوە زۆر ئەستمە بۆ هەر توێژەرێکی کۆمەڵایەتیی بلێ
مرۆڤ بریتییە لە...! چونکە ئیتر ئەم مرۆڤە هەڵگری یەک شوناس نی
بەڵکو چەندین شوناس، هەڵگری کولتورێک نییە، بەڵکو چەند
کولتور، ئێنتیمای بۆ (خود)ێک نییە بەڵکو چەندین خود.

زۆر جار بەشێک لەو توێژەرانەی کە ڕاستەوخۆ یان نا ڕاستەوخ
بەرگریی لە تێزەکانی سامۆیل هونتیگتۆن دەکەن لە کوردوست
دەیانەوێت ئیسلامی سیاسیی کوردی وەک هەڵگری ڕابردوویە
گونجاوی گونجاوکراوی گونجاوکار بخەنە بەردەستی ئێمە. و
ئەوەی کە ئیسلامی سیاسیی لە کوردوستاندا هەڵگری یەک شوناس
یەک کولتور و یەک خودی تەباو نەگۆڕو بەردەوام بن. ئەم خوێند
سامۆیل هونتیگتۆنیانە بەرهەمهێنەری جەهلن و واقیعمان
تەماوییدەکەن، بۆ ئەوەی وەک خۆی نەیبینین. تەواو بە پێچەوانە
من پێموایە، کاروانی کارکردنی یەکگرتووی ئیسلامیی لە سا
پەنجاکانەوە تا ئەمڕۆو کۆمەڵی ئیسلامیی لە هەشتاکانەوە تا ئەم
باشترین نموونەی ڕەتکردنەوەی تێزەکانی سامۆیل هونتیگتۆ
سەلماندنی کائینی فرە-خود و فرە-شوناس و فرە-کولتورن. ئ
یەکێکە لەو هۆکارە هەرەگرنگانەی کە پاڵی پێوەنام پرۆژ
دکتۆراکەم بۆ توێژینەوەی ئیسلامی سیاسیی لە کوردوس
تەرخانبکەم.

## بەشی چوارەم

# ئیسلام و پانتایی گشتیی، وەک بیناکردنی شوناسەکان

### ١. سەرەتا

دەرکەوتنی سەرپۆشی ژنە موسوڵمانەکانی فەرەنسا، دوو دەرهاویشتەی گرنگ دەخاتە بەردەستی ئێمە: یەکەمیان بریتییە لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ پانتاییەکی گشتیی لایەکدا و دووەمیشیان بریتییە لە چوونە نێو سنوورەکانی ململانێیەکی مێژوویییەوە، کە بە قووڵایی فەرەنسادا ڕووەتە خوارەوە. لەم دوو خاڵەدا تەواوی ئەو ئیسلامانەی کە لە سەرپۆشی ژنە موسوڵمانەکاندا خۆیان مانیفێستدەکەن، یەکدەگرنەوە.

پەیوەندیی نێوان سەرپۆش و ئەویتر، لە فەرەنسادا، ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر چاودێریی و پرسیارلێکردن و بەدواداچوون و ڕەخنەگرتنی لایسیتێوە. سەرپۆش سامبۆلێکی بینراوەو ژنە موسوڵمانەکان ناتوانن بیشارنەوە. سەرپۆش بەردەوام لەنێو کردەی دەرکەوتندایە. لە ڕێزمانی توێژینەوەی سەرپۆشبەسەرەکاندا فیعلی "دەرکەوتن" گرنگییەکی تایبەتی هەیە. دەرکەوتن لەکوێ؟ دەرکەوتن چۆن؟ دەرکەوتن کەی؟ دەرکەوتن بۆ کێ؟ ئەمانە کۆمەڵە پرسیارێکن کە دەکرێت بەدرێژیی لەسەریان بووەستین.

ئێمە لەبەردەم سەرپۆشێکداین کە لە چرکەی دەرکەوتنیدا زەنگەکانی ئاین بۆ لایستێی پانتاییە گشتییەکان لێدەدات. واتە سەرپۆش سەرلەنوێ و بەدوایخۆیدا جارێکیتر ئاین ڕادەکێشێتەوە نێو پانتاییە گشتییەکان. لێرەدا فیعلی "دەرکەوتن" زیاتر وەک پرۆژەی ململانێ و جەنگ و پابەندبوون دەردەکەوێت.

چۆن ئێمە گەیشتینە ئەم ئاستەی ڕووبەڕووبوونەوە؟ چۆن سەرپۆش وەک حەماڵی ئاین و پانتایی گشتیی وەک حەماڵی لایسیتی دەستەویەخەبوون و جەنگیان لەدژی یەکتری ڕاگەیاند؟

### ٢. لایسیتێی فەرەنسی و قەیرانەکانی.

دوای ئەو هەموو دیالۆگ و کۆمیسیۆن دروستکردن و کتێب و سەدان کۆنفرانسەی کەلەسەر لایسیتیی کرا، ئێمە بەباشیی تێگەشتین لەوەی کە ئەم کۆنسێپتە وەک لاستیک وایەو تارایکێشیت کێشیدێت. ئێمە تێگەشتینن لەوەی کە یەک پێناسە و یەک تێگەشتن بۆ ئەم چەمکە نییە. بە پێچەوانەوە، ڕەنگە ئەم چەمکە یەکێبێت لەو مەیدانانەی کە ناکرێت دواقسەی لەسەربکرێت و دەرگاکانی بەکراوەیی دەمێننەوە. ئەمەش وامان لێدەکات بڵێین لایسیتیی بە سیغەی موفرەد بوونی نییە، موفرەد نییە. بەپێچەوانەوە، ئەوەی ئێمە وەک توێژەر تێبینی دەکەین دەرکەوتنی لایسیتییە لە سیغەی جەمعدا Pluriel. لایسیتیی laïcité لە بەریتانیا هەمان لایسیتێی فەرەنسی نییە. لە بەریتانیادا، ژنە سەرپۆشبەسەرە موسوڵمانەکان مافی ئەوەیان هەیە ببن بە پۆلیسی گومرگ و لە فرۆکەخانەکاندا کاربکەن و هتد. بەڵام لەفەرەنسادا بەخەونیش نایبینن. لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا هەموو سەرۆکەکان پێشئەوەی برۆنە نێو کۆشکی سپییەوە دەبێت بە بەرماڵی خوادا تێپەڕن و سوێند بە کتێبە پیرۆزەکەی بخۆن. بەڵام لەفەرەنسادا سەرۆک و جمهوریەت بێ خودان و نە ئەوان دەستدەخەنە کاروباری خوداوەو نە خوداش دەستدەخاتە کاروباری ئەوانەوە. لە فەرەنسادا کەمنین ئەو جێگایانەی کەلەسەریان نووسراوە ئێرە خوای لێنییە.

هیچ یەکێک لە ئێمە گومانی لەوەنییە کە بەریتانیا و ئەمەریکا دوو وڵاتی ئاینیی نین، ئەوەی کاروباری وڵات دەبات بەڕێوە ئاین نییە و

ئـاین دوورخـراوەتـەوە لـە ژیـانی رۆژانـە و لـە رێکخـستنی پانتاییـە گشتییەکـان. و بـەهـا کۆمـەڵایـەتییـەکان لـەسـەر ئاسـتی تـاک و گـروپ زیاتر بەهاکانی لایسیتێن وەک لە بەهاکانی ئاین. لێرەوە ئێمە دەگەینـە ئەو قەناعەتەی بڵێین لایسیتێ بە سیغەی موفرەد بوونی نییە. و لەهەر وڵاتێکدا تاقانـەیـی singularité خۆی دەپارێزێت. لـە کاتێکدا کـە لـە هەریەکێک لـەو دوو وڵاتـەدا پانتاییە گشتییەکـان ئامـادەن موفاوەزات لـەسـەر هێمـا ئاینییـەکـان بکـەن، لـە فـەرەنـسادا بـەهـیچ شـێوەیـەک موفـاوەزات لـەسـەر هێمـا ئاینییـەکـان ناکرێـت و ئـەوەی بـۆنی ئـاینی لێوەبێت لە پانتاییە گشتییەکاندا دەکرێتە دەرەوە. لێرە جمهوریەت ئاین تەنها لە سنورە شەخسیەکاندا دەبینێت و ئاین بۆی نییە ئەو سنورانە ببەزێنێت.

### ٣. ئیسلامی فەرەنسی و قەیرانەکانی.

لێرەوە بۆ ئێمە گرنگە تێبگەین لەوەی کە ئیسلامی دەرکەوتوو لـەنێو سـەرپۆشـە فـەرەنـسییەکانـدا رووبـەرووی چ جۆرێـک لـە لایـسیتێ بـووەتـەوە. بـەڵام پـێش هـەمووشـتێک دەبێـت خۆمـان روونبکـەینـەوە ـەسەر دەستەواژەی " terme " ئیسلام: ئێمە قسە لەسەر کام ئیسلام ـەکەین؟ ئایا ئێمە ئیسلامێکمان هەیە کە کۆی موسوڵمانانی فەرەنسا ـەسـەری رێککـەوتبن؟ راسـتە هـەموویـان بـاس لـە ئیسلام بـەسیغەی ـوفرەد دەکـەن، بـەڵام ئایـا ئـەو ئیسلامە تاقانـەیـە لـە ژیـانی هـەموو ـۆژێکدا بـوونی هـەیـە؟ ئێمـە قـسە لـەسـەر چ ئیسلامێک دەکـەیـن؟ ئیسلامی دۆگمـەکـان؟ بـەڵام هـەمووومـان دەزانین کـە ئـەو دۆگمانـە بـە ـەزاران شێوەی جیاواز راڤەکراون. ژنە سەرپۆشبەسەرە فەرەنسییە سەلەفییەکـان، هـەمـان راڤـەکردنی ژنـە سـەرپۆشبەسـەرە فەرەنسییە ئیخوانییـەکانیـان نییـە. ژنـە سـەرپۆشبەسـەرە فـەرەنـسییە سۆفییەکان بـەشـێوەیـەکی رادیکالانـە تـەفـسیری مـەلا گـەنجـە فـەرەنـسییەکـان

رەتدەکەنەوە. مزگەوتە گەورەکانی پاریس و لیۆن و مارسیلیا بەهیچ شێوەیەک ئەو تەفسیرەی ئیسلام قبوڵناکەن کە ژێرزەمینە بەمزگەوتکراوەکانی پاریس و لیۆن و مارسیلیا پێشکەشیدەکەن. لێرە ئیسلام لەسەر ئاستی "فرە، فرەیی، کۆ، جەمع، پلوریال" ئامادەیە. واتە هەڵەیەکی مەنهەجیی دەکەین گەر هەموو موسوڵمانانی فەرەنسا لەیەک ئیسلامدا کورتبکەینەوە. من لێرەدا لەگەڵ گەورە سپێسیالیستی ئیسلامی سیاسییدا " ئۆلیڤەر روا" یەکدەگرمەوە، کە دەڵێت:

**" قسەکردن لەسەر ئیسلام بە پیتی ا کەپیتال رێگای ئەوەمان لێدەگرێت لە پراتیکی کۆنکریتیی ئەو کەسانە تێبگەین کە خۆیان وەک موسوڵمان دەناسێنن "**[٢٤]

ئێمە لێرەدا هەست بەوەدەکەین کە رووبەرووی زەرورەتێکی هەنوکەیی بووینەوتەوە، ئەویش بریتییە لە بەکۆنسێپتکردن و تیۆریزەکردنی هەردوو دەستەواژەی ئیسلام و لایسیتێ. چونکە بەبێ ئەمکارە ئەستەمە بتوانین لە دەرکەوتنی سەرپۆشبەسەرە فەرەنسییەکان بگەین. لەم قەناعەتەوە هەنگاوی یەکەم دەنێم و لە لایسیتێ وە دەستپێدەکەم.

لەگەرمەی ئامادەکردنی یاسای قەدەغەکردنی سەرپۆش لە قوتابخانەکاندا، هەریەکێک لە ئێمە ئەو شانۆگەرییەی بینی چۆن نومایشکرا. ئێمەی بینەران بینیمان چۆن لایسیتێی فەرەنسی بەهەموو توانایەوە رووبەرووی دەرکەوتنی ئاین لە پانتاییە گشتییەکاندا بووەوەو چۆن جمهوریەت ئامادەیە موفاوەزات لەسەر هەموو شتێکبکات تەنها ئەو شتانە نەبێت کە بۆنی ئاینیان لێوە دێت.

### ٤. ئایا سەرپۆشی ژنە فەرەنسییەکان هەرەشە لە لایسیتێی جمهوریەت دەکات؟

بەبروای من ئەوەی لێرەدا دەکرێت گرەوی لەسەربکرێت و وەلامی ئەم پرسیارە بداتەوە، تەنها ئەو شتەیە کە ناوی دەنێین " شوناسی جمهوریەتی فەرەنسی". مەترسییەکە بەمشێوەیەیە: سەرپۆش لە چرکەی دەرکەوتنیدا لە پانتاییە گشتییەکاندا، راستەوخۆ وەک تیر ئەو شوناسە دەپێکێت و برینداری دەکات و پێلاوەکانی پردەکات لەخوێن. لەوەش زیاتر، سەرپۆشی ژنەکان لە قۆناغێکی تەواو ناسک لە مێژووی فەرەنسادا دەردەکەوێت، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ شوناسەکەی بخاتە ژێرپرسیارو رەخنەوە. ئەم شوناسە خۆی بۆ خۆی لە ئێستادا کەمێک لەرزۆک بووەو لەلایەن یەکێتی ئەوروپاوە ناچارکراوە بەوەی دەستهەلبگرێت لە هەندێک لە تایبەتمەندییەتەکانی، بۆ ئەوەی لە ناو ئەو یەکێتییەدا جێگای ببێتەوە. واتە یەکێتی ئەوروپا وەک رووداوێکی گرنگی مێژوویی لە دەرەوە دێت و فەرەنسا ناچاردەکات بەوەی بەشێک لە تاقانەیی خۆی و بەشێک لە بەهاکانی وازلێبێنێت لە پێناوی ئەو دونیا تازەیەدا کە دەیەوێت لە دامەزرێنەرانیبێت. دیارە دامەزراندنی یەکێتی ئەوروپا، وەک دونیایەکی تازە، بە تونێلی دانوستاندا تێدەپەرێت. فەرەنسا دەبێت رازیبێت بە دانوستان لەگەڵ بیست و چوار دەوڵەتی تردا. لە موفاوەزاتیشدا دۆراندن و بردنەوەش هەیە. گوومانی تێدانییە کە فەرەنساش وەک هەرولاتێکی دیکە بەشێک لە سەروەریی و بەهاو تاقانەییەکەی دەدۆرێنێت. و ئەم دۆراندنەش ناچاریدەکات بە سەرلەنوێ بیناکردنەوەی ئەو شوناسەی تائێستا هەیبووە. ئا لەمکاتە ناسکەدایە کە سەرپۆشی ژنە موسوڵمانەکان وەک رووداوێک لە ناوەوە دێت بۆ ئەوەی گورزی خۆی لەم شوناسە لاوازبووە بووەشێنێت. گەر یەکێتی ئەوروپا وەک رووداوێک لەدەرەوە شوناسی فەرەنسای بریندارکردبێت، بێگومان سەرپۆش

وەک ڕووداوێک لە ناوەوە دێت بۆ ئەوەی ئەو برینە قوڵتر بکاتەوە. دەڵێین ڕووداوێک لە ناوەوە، چونکە سەرپۆشبەسەرەکان، کوردو ئەفگانی و سعودی و یەمەنی نین. ئەوان فەرەنسین و جگە لە فەرەنسی هیچ زمانێکیتر نازانن.

*٥. پیرە جمهوریەت چۆن وەڵامی ئەم دوو ڕووداوە دەداتەوە[٣٥]؟*

ئەوەی ئێمە تێبینیدەکەین، ئەوەیە کە جمهوریەت ڕازییە بەوەی بڕواتە نێو ڕەوتی موفاوەزاتی شوناسەوە لەگەڵ یەکێتی ئەوروپادا. لەهەمانکاتیشدا، تەواوی دەزگاکانی دەوڵەت دەخاتەکار بۆ ئەوەی کە فەرەنسییەکان قەناعەتیان پێبێنێت کە ئەنتیگراسیۆن-ئیندیماج-ئاوێزانبوون بە ئەو پانتاییە قبوڵبکەن. بە هەمان نەفەسیش و بەوپەڕی هێزیەوە، هەموو ڕەوتێکی (پرۆسێسیوس) دانوستان لەسەر ئاستی ناسیۆنال واتە لەسەر دەرکەوتنی سەرپۆش ڕەتدەکاتەوە.

کۆمینۆتێی ئەوروپی، بەمشێوەیە وەک ڕووداوێک لە دەرەوە، دێت و شوناسی جمهوریەت دەخاتە قەیرانەوە. لەهەمان زەمەنیشدا، سەرپۆشبەسەرەکان وەک ڕووداوێک لەناوەوە دێن و ئەو قەیرانە قوڵتردەکەنەوە.

ئەوەی من وەک توێژەرێک تێبینیمکردوە، ئەوەیە کە لە فەرەنسادا، پانتاییە گشتییەکان لایسیتێ وەکِ عەقیدە مومارەسەدەکەن، وەک فەلسەفەیەک ئیمانی پێدێنن. پانتاییە گشتییەکان ریشەکانی لایسیتێ لە نێو قوڵاییەکانی سەدەی نوێگەرییدا دەبینن. واتە دابڕان لەگەڵ هەموو ئەو بەهایانەی کە لە ئاینەوە سەرچاوەدەگرن و پێشنیازکردنی هەموو ئەو بەهایانەی کە لایکن و لە لایسیتێ وە سەرچاوەدەگرن. لێرەدا ئیمان بە لایسیتێ وەک فەلسەفە دابڕانە لەگەڵ ئیمانی ئاینییدا[٣٦].

ئەوەی لێرەدا جێگای تێبینییە، خودی ئەو فەلسەفەیەیە کە نایەوێت بەتەنها لە گەردوونی فەلسەفەدا بژی و خۆی تەرجەمەدەکاتە سەر

یاسایەک کە پانتایی گشتیی دەبات بەرێوە. خۆی پێشنیازدەکات وەک ئەو پرانسیپە هاوبەشەی کە رۆڵی ئاین و کردە ئاینییەکان لە نێو پانتاییە گشتییەکاندا دیارییدەکات. لە رێگای ئەو دەسەڵاتە بێسنورەوە کە هەیەتی کۆتایی بە هەیمەنی ئاینی دێنێت. ئیتر ئەوانەی کە پانتایی گشتیی رێکدەخەن، قەشە و مەلاکان نین، کەنیسە و مزگەوتەکان نین، بەڵکو ئەو یاسایانەن کە لە لایسیتێی "فەرەنسییەوە" سەرچاوە دەگرن.

### 6. جمهوریەت: لە کەنیسەوە بۆ مزگەوت.

ئێمە گەر بگەرێینەوە سەر گەنجێتیی ئەم کێشە و ململانێیە، لە بەرامبەر لایسیتێی فەرەنسیدا، ئەکتەرێکی سەرەکی دەبینین کەبریتییە لە کەنیسەی کاتۆلیک. ململانێی نێوان جمهوریەت و کەنیسەی کاتۆلیک دەگەرێتەوە بۆ 1789 و بەردەوام دەبێت تا 1924، لەم ساڵەدا کەنیسەی کاتۆلیک بەشێوەیەکی رەسمیی جیابوونەوەی ئاین لە دەوڵەت و دەوڵەت لە ئاین و یاسای 1905 قبوڵدەکات. واتە دوای 135 ساڵ لە ململانێ، کەنیسەی کاتۆلیک تەسلیم بە لایسیتێ دەبێت. لێرەوە دەبینین کە چۆن مێژووی لایسیتێ لکاوە بە مێژووی جمهوریەتی فەرەنسییەوە.

لەنێو پانتاییەکی ئاواداو مێژوویەکی بەململانێ بیناکراوی ئاوادایە کە ژنە سەرپۆشبەسەرەکان دەردەکەون و ئاین دەهێننەوە نێو ئەو پانتاییانەی لێی دەرکرابوو. بێگومان ئەم گەرانەوەو دەرکەوتنە هەر لە یەکەم هەنگاودا بەر شوناسی جمهوریەت دەکەوێت و لە پاش دەرکردنی یاسای قەدەغەکردنی سەرپۆشیش لە قوتابخانەکاندا، ئیتر ململانێی نێوان جاسوسەکانی خواو جاسوسەکانی لایسیتێ سوتێنەرترو توندوتیژتردەبێت.

با پێکەوە فەحسی ئەم ئەزموونەی خوارەوە بکەین:

یەکێک لەهاورێکانم کە پەناهەندەی سیاسییە لە فەرەنسادا، لەگەڵ خانمێکی فەرەنسیدا بڕیاریاندا پێکەوە خێزان دروستبکەن. هەفتەیەک پێش ئاهەنگی مارەبڕین، پێشنیازی ئەوەم بۆکرد کە بۆ ئاهەنگی مارەبڕین، یەکێک لە هاورێکانی زانکۆ کە کچێکی سەرپۆشبەسەرە، بە ناوی سارا، بانگهێشتبکات. هاورێکەم پێشنیازەکەی قبوڵکردو پێکەوە سارامان دەعوەتکرد. من دەمویست ئەزموونێک لەسەر ساراو خانەوادە فەرەنسییەکانی پاش یاسای قەدەغەکردنی سەرپۆش لە قوتابخانەکاندا بکەم. ئەزموونێک بە خوێن و گۆشتەوە. ئەزموونێک کەخۆم تیادا هەم رێکخەرو هەم چاودێریشبم. دەمویست دەرکەوتنی کچێکی سەرپۆشبەسەری مۆدێرنی زانکۆ لەنێو ئاهەنگێکی جەماوەری فەرەنسیدا ببینم. دەمویست جوڵانەوەو کردەو رەفتارەکانی سەرپۆشبەسەرێکی دوای یاسا لەنێو حەشاماتێکی بۆرژواداو شێوازەکانی پێشوازییکردن لێی بخەمە ژێر چاودێرییەوە.

ساراش دەعوەتنامەکەی قبوڵکرد. پێمانگووت کە لەو ئێوارەیەدا حیساب بۆ هەمووشتێک دەکرێت، چونکە خانەوادەی کچەکە هەموویان لە چینی بۆرژوازی فەرەنسین. ئەو بۆرژوازانە هەموو شتێکت دەخەنە ژێر تێبینییەوە. پێڵاوەکانت، گۆرەویەکانت، پانتۆڵەکەت، کراسەکەت، خەندەکانت، چۆنیەتی جوڵانەوەت، چۆنیەتی نانخواردنت، چۆنیەتی بەکارهێنانی دەسری دەمسرینت، چۆنیەتی سوپاسکردنت، چۆنیەتی قسەکردنت، چۆنیەتی دانیشتنت. هتد.

ئاهەنگی مارەبڕین لە نیوەڕۆوە تا کاتژمێر دوازدەی شەو بەرداوامبوو. لە کاتژمێر نۆی ئێوارەدا سارا گەشتە لامان و هاتە نێو هۆڵەکەوە. دایکی بووک کە سەرپۆشەکەی سارای بینی یەکسەر فووی تێبوو. دەستبەجێ داوای روونکردنەوەی لە مێردی کچەکەی و کچەکەی کرد.

ئەو ئافرەتە میهرەبانەی چەند چرکەیەک لەمەوپێش تەواو گۆرا، ئەو بە کچەکەی و مێردەکەی دەگووت کە سەرپۆش تەنها پارچە پەرۆیەک نییە بەسەر ئافرەتێکەوە، بەڵکو هێمای عونسوریەت و سنورشکاندن و یاسا شکاندن و تێرۆریسمە. چۆن ئێوە رازیبوون بەوەی کە هێمای تێرۆریسم بەشداریی ئاهەنگەکەتان بکات !

کورو کچە دەیانویست خەسو تێبگەیەنن لەوەی کە سارا نە تێرۆریستەو نە ئەنتیگریست، سارا کچێکی مۆدێرنی موسوڵمانە. بەڵام وەک دەڵێن تازە کەشتییەکە کەناری بەجێهێشتبوو، تازە تیر لە کەوان دەرچووبوو. بەکورتیی سارا لەبەر سەرپۆشەکەی پێشوازیی لێنەکرا. ناچار لەپەنای ئێمەدا مایەوەو نزیکەی کاتژمێر دەی ئێوارە کشایەوەو هۆڵەکەی بەجێهێشت. پێشئەوەی بڕوات پێیگووتم: دڵت هیچ نەکات بۆمن، من راهاتووم لەگەڵ ئەم جۆرە کاردانەوەیەدا.

لەم ئەزموونەدا تێبینیمکرد کە بەریەککەوتنی ئاین و لایسیتێ تا چ رادەیەک لەفەرەنسادا توندوتیژو بریندارکەرە. هەروەها تێبینی ئەوەشمکرد کە چۆن وردە وردە ئیسلامی ئەمرۆ لەبری کەنیسەی کاتۆلیکی دوێنێ، جەنگی ئاین لەگەڵ لایسیتێ دا دەکات. جەنگێکی سامبۆلیک بەڵام ترسناک.

**ئێستا با پێکەوە ئەزموونێکی دیکەش فەحسبکەین:**

کچێکی تەمەن پانزەساڵی موسوڵمان، پاش یاسای قەدەغەکردنی سەرپۆش لە قوتابخانە ناوەندیی و ئامادەییەکاندا، ئامادەنییە سەرپۆشەکەی لاببات و بە سەری رووتەوە بڕوات بۆ قوتابخانە. ئیدارەی قوتابخانەی لویس-پاستۆری ئامادەیی لە ستراسبورگیش بەتوندیی ئامادەبوونی ئەو کچە بەسەرپۆشەوە رەتدەکاتەوە. ئەو کچە کە ناوی "سوونەت"ە ئیتر رێگای پێنادرێت لە دەرسەکانیدا بەردەوامبێت. سوونەت هەموو رێگاکان دەگرێتەبەر بۆ ئەوەی بە سەرپۆشەوە بگەرێتەوە بۆ قوتابخانە، هەر لە کڵاوەوە تا دەگاتە

بیریَ، بەکاردەهێنێت، بەڵام بێهودەیەو هەوڵەکانی سەرناگرن. ناچار بەیانییەک سوونەت دەگەڕێتەوە بۆ قوتابخانە، بەڵام بەسەری تاشراوەوە. سەرێک وەک پەتاتە ساف. سەری بەگوێزان دەتاشێت و دەڵێت گەر ڕێگام نادەن بەسەرپۆشەوە بگەڕێمەوە قوتابخانە، ئەوا بەسەري تاشراوەوە دەگەڕێمەوە. کە( ئا.ف.پ) پەیوەندیی دەکات بە پەروەردەی ستراسبورگەوە بۆ بەدواداچوونی ئەو هەواڵە، بەڕێوبەرایەتی پەروەردە دەڵێت ئێستا هیچ گرفتێکمان نەماوە، چونکە سونەت سەرپۆشەکەی لابردووەو هیچ یاسایەکیش نییە کە خوێندکاری سەرتاشراو لە خوێندن قەدەغەبکات.

سەرتاشینی سوونەت شایەتییەکی دیکەیَ ئەو بەریەککەوتنە توندوتیژەی شوناسی پانتایی گشتیی و شوناسی سەرپۆشبەسەرەکانە.

پارادۆکس-موفارەقەکە لێرەوە دەستپێدەکات. لایسیتیَ دەیەوێت ئاین و شتە ئاینییەکان لەنێو سنورە شەخسییەکاندا کۆبکاتەوە. و دەیەوێت پێمانبڵێت کە هیچ کەسێک مافی ئەوەی نییە دەست وەرداتە کاروباری ئاینیی کەسێکی دیکەوە. کەس بۆی نییە بە کەسێکی دیکە بڵێت تۆ مافی ئەوەت نییە ئەو ئاینە هەڵبژێریت و بەوشێوەیە دینداریی بکەیت. هەموو ئەمانە بەمەرجێک کە ئاین لە سنورەکانی تاک نەیەتە دەرەوەو لە شوێنە گشتییەکاندا دەرنەکەوێت. بەڵام گرفتەکە لێرەدا ئەوەیە کە ئەم پێشنیازە سەرلەبەری دەرکەوتنی ژنە سەرپۆشبەسەرەکان دەخاتە ژێر پرسیارەوە. ئەو ژنانە کە لەماڵەوەن و کە لەنێو ژیانی تایبەتی خۆیاندان و کاتێک لەگەڵ مەحرەمدان، پێویستیان بەوە نییە سەرپۆش بەسەریاندا بدەن. ئەوان لەکاتی ئامادەبوونی ئەویتردا، واتە دەرکەوتنیان لە پانتاییە جەماوەرییەکاندا. بەپێی ئاینەکەیان دەبێت سەرپۆش بکەن و بۆ ئەم مەبەستەش قورئان تەعبیئەدەکەن.

لێرەدا گرفتی سەرپۆشبەسەرە فەرەنسییەکان زیاتر ئالۆزدەبێت.
ونکە سەرپۆش لە دەقە قورئانییەکاندا وەک ئیختیارێک خۆی
شنیازناکات، بەڵکو وەک دۆگمێک، وەک فەرزێکی ئاینیی. ئەم دۆگمە
ەواو روونە، فەرماندەکات بە ژنانی موسوڵمان، لە کاتی
ەرکەوتنیاندا بۆ ئەویتر، سەرپۆشبکەن و پرچیان دەرنەخەن. لێرەدا
پسیارێکی زۆر گرنگ یەخەمان پێدەگرێت و دەبێت لەسەری
بوەستین و قسەی خۆمانی لەسەر بکەین. پرسیارێک کە رەنگە
ەری ئاین و لائیسیتێ پێکەوە بخوات:

**ئایا جمهوریەتی لایک، دەوڵەتی لایک، شەرعیەتی ئەوەی هەیە
ەستوەرداتە رێکخستنی دۆگمەکانی ئاینێکەوە؟**

لەسەر ئاستی تیۆریی، لێرە لە فەرەنسا، دادگاکان و دەزگاکانی
ەوڵەت بەردەوام ئەوە دووبارەدەکەنەوە کە دەوڵەت مافی ئەوەی
یە دەستوەربداتە کاروباری دۆگمەوە، تا ئەوکاتەی کە دۆگم وەک
ۆگم دەمێنێتەوەو دەستوەرناداتە رێکخستنی پانتایی گشتییەوە. بەڵام
ەی ئەگەر دەستیوەردایە نێو رێکخستنی پانتایی گشتییەوە، ئایا
ەوڵەت مافی ئەوی هەیە رێگای لێبگرێت؟ باشە چی روودەدات گەر
ەوڵەت نەیەتە دەنگ و رێگا لەدەستتێوەردانی دۆگم نەگرێت؟ باشە
ی روودەدات، گەر دەوڵەت تەنها لەو کاتانەدا مافی ئەوەی هەبێت
دەنگبێت کە دۆگم دەستوەردەداتە پانتاییەکی گشتییەوە؟ گەر ئێمە
ەم گریمانەیە بسەلمێنین، گریمانەی ئەوەی کە دەوڵەت مافی
ستتێوەزدانی نییە تەنها لەکاتی دەرکەوتنی دۆگمدا نەبێت لە پانتاییە
شتییەکاندا، لێرەدا کارەسات روودەدات، چوونکە موسوڵمانێک بۆ
بەجێکردنی دۆگم لەسەر مورتەدێک دێت و موسوڵمانێکی مورتەد
نێو حەوشەی مزگەوتێکدا سەردەبرێت و دەوڵەتیش مافی ئەوەی
بە قسەبکات، چونکە مومارەسەکردنی ئەو دۆگمە لەحەوشەی
گەوت نەرۆشتووەتە دەرەوەو حەوشەی مزگەوتیش پانتاییەکی

گشتیی لایک نییە، بەڵکو حەرەمی ئاین و جەرگەی ئاینە. واتە گەر لە حەوشەی مزگەوتی گەورەی پاریسدا، موسوڵمانێک مورتەدێکی سەربری، بەپێی ئەوگریمانەیە، دەوڵەت مافی بەدەنگهاتنی نییە، چونکە ئەو لەنێو مزگەوتێکدا مومارەسەی دۆگمێکی کردووە. کوشتنی ئەپۆستا-مورتەد، کارێکی نائاسایی نییە لە مێژووی مزگەوتدا، مزگەوت خۆی بە جێبەجێکاری فەرمانی خوداوەند دەزانێت. تازەترین نموونە: کوشتنی فەرەج فوودە بە چەقۆو هەلاهەلاکردنی نەجیب مەحفوزو پاشان چیرۆکی دراماتیکیی نەسر حامد ئەبوو زەیدو فەتوای کوشتنی سەلمان روشدی، زەقترین رووی ئەم دیاردەیەن.

بەڵام ئایا ئەمە ئەو واقیعەیە کە ئێمە لە ژیانی هەموو رۆژێکدا، لە فەرەنسادا، تێبینی دەکەین؟ ئایا دەوڵەت دەستوەرناداتە کاروباری دۆگمەوە؟ ئێمە تەواو لە زانست دووردەکەوینەوە گەربڵێین بەڵێ. چونکە دروسکردنی ئەنجومەنی موسوڵمانانی فەرەنسا لەلایەن وەزارەتی ناوخۆی فەرەنساوە، باشترین نموونەی دەستتێوەردانی کاروباری دۆگمە. لێرەوە؛ پێویستە ئیتر دەوڵەت واز لەو گوتارە بۆشە بێنێت و دان بەو واقیعە نوێیەدا بنێت کە ئەمرۆ دروستبووە.

من پێموایە ئەم واقیعە نوێیە شوناسی جمهوریەت ناچار بە قەیران دەکات. لەلایەکەوە جمهوریەت، لەساڵی ١٩٠٥دا و بەپێی یاسای جیاکردنەوەی دەوڵەت لە ئاین، مافی ئەوەی نییە دەستوەربداتە کاروباری دۆگمەوە، لەلایەکی دیکەوەو بەرۆژی نیوەرۆ ئەنجومەنی ئاینیی دروستدەکات و دەستوەردەداتە نێو شتە هەرەوزدەکانی دۆگمەوە. ئەمە ئەو قەیرانە واقیعییەیە کە شوناسی جمهوریەتی تیادا وندەبێت.

## ٠١.کۆتایی.

ن پێموایە جمهوریەت هەڵەیەکی گەورەدەکات گەربێت و لەپشت
سە رزاوو کۆنەکانی لایسیتێوە خۆی بشارێتەوە. ئاخر ئێمە ئیتر لە
ەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمدا ناژین. ئیتر جمهوریەت لەبەرامبەر
یسەی کاتۆلیکدا نییە! ئێمە لەسەدەی بیستو یەکدا دەژین و
وریەتیش لەبەرامبەر ئەکتەرێکی نوێدایە، کە بریتییە لە ئیسلام.
سلامێک کە تائێستا، دەڵێم تائێستا، باوەری بە جیابوونەوەی
ـسەر و خوداوەند نییە. ئەم دۆخە تایبەت و تاقانەیە ئێمە
ردەکات بەوەی لە پێناسە کۆن و رزیوەکانی لایستێ و پانتایی
یی و شوناس بێینەدەرەوە.

ێڤەر روا پێیوایە کە لایسیتێی فەرەنسی ترسێکی بەردەوامی لە
سلام هەیە. و دەیەوێت موهاجیرەکان لە ئیسلام دابېرێت.
کەسێک کە نەبێتە هەڵگری بەهاکانی رۆژئاوا، ئیتر نابێت بە
نسی حسابېکرێت. ئۆلیڤەر روا پێیوایە ئەمە هەڵەیەکی کوشندەیە.
لەم خاڵەدا هاودەنگم لەگەڵ ئەو. پێموایە جمهوریەت دەبێت
ترسە لە ئیسلام، لەخۆی دابرنێت و سەرلەنوێ و بەپێی
اویشتەکانی ئێیستا و ئێرە پەیوەندیی خۆی لەگەڵ ئیسلامدا
کاتەوەو رێگانەدات منداڵە موسوڵمانەکانی جمهوریەت بەرەلای
نەکانی ئیسلامیسم و پرۆژە سیاسییەکانی ببن. ئەم کردەیەش
، سەرلەنوێ دەستکارییکردنەوەی شوناس و سەرلەنوێ
ناسەکردنەوەیە. ئەمە ئەوگرەوەیە کە دەکرێت لەسەر داهاتووی
ن.

## بەشی پێنجەم

# دەرکەوتنە نوێیەکانی ئیسلام

*١.سەرەتا.*

دەرکەوتنی ژنە موسوڵمانە سەرپۆشبەسەرەکان لەنێو پانتایی گشتییەکاندا، گوزارشتکردنە لە دیاردەیەکی زۆر گرنگ، کە دەکرێت ئامادەبوونی ئیسلام لە ئەوروپا بەگشتیی و لەفەرەنسادا بەتایبەت ناوزەدی بکەین. پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە کە ئایا فەرەنسا؛ رۆشنگەریی، فەرەنسای شۆرش، فەرەنسای مافی مرۆڤ مۆدێرنیتی، کارایی داناوە بەسەر ئیسلامی ئەوروپی بەگشتیی ئیسلامی فەرەنسی بەتایبەتی؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، ئێمە هەڵەیەکی گەورە دەکەین گە بگەرێینەوە بۆ دەقە پیرۆزەکانی قورئان. چونکە ئەو ئیسلامانەی ک ئێستا لە دونیای مۆدێرندا کاردەکەن، رەگوریشەکانیان لەنێو پراکتیک ژیانی هەموو رۆژێکی موسوڵماناناندا و لەنێو گوتارەکانی ئێرە ئێستایانداو لەنێو بەرژەوەندییە هەنووکەییەکانیاندایە نەک لە نێ قورئاندا. واتە بۆ ئێمە وەک توێژەر، ئەوەی گرنگە " هەموو ئە شتانەن کە موسوڵمانەکان دەڵێن قورئان وتویەتی"[٣٧] نەک ئەو شتانە: قورئان دەیڵێت.

ئەم تێزە بەهیچشێوەیەک مانای ئەوەنییە کە موسوڵمانانی فەرەنس لە دابرانێکی تەواودان لەگەڵ قورئاندا، یاخود قورئان کارایی نیی بەسەر پراکتیکی موسوڵمانانی فەرەنسییەوەو بەشدارنییە لـ بیناکردنی شوناسەکانیاندا. من بە هیچشێوەیەک ئارەزووی ئەوەم نی

بەرگریی لەم گریمانەیە بکەم، چونکە تەواو دوورە لە واقیعەوە.
پێچەوانەوە، ئەو دەرهاویشتانەی کە لەبەردەستی مندان،
مانەیەکی دیکە دەسەلمێنن، گریمانەی دابران و بەردەوامبوون. من
وایە کە موسوڵمانانی فەرەنسا لەنێو بزوتنەوەیەکی بەردەوام لە
ران و بەردەوامبووندان. کاتێک دەڵێم دابران مەبەستم دابرانیانە
ەڵ بەشێکی گەورەی ئەو ترادیسیۆن و تەفسیرو راڤەکردنانەی
لام کە پەیوەندیی بە " ئێرەو ئێستای" ئەوانەوە نییە. لەهەمانکاتدا
ران لەگەڵ ئیسلامدا بەردەوامن، بەڵام لەرێگای ئەو تەفسیرو
کتیک و گوتارە نوێیانەوە کە خۆیان لە ئیسلامەوە بەرهەمیدەهێنن.
ەرەنجامی تەحلیلی من بۆ ئەو دەرهاویشتانەی کە لەسەر مەیدان
بنیمکردن و کۆمکردنەوە شتێکی گرنگم پێدەڵێن، شتێک کە رەنگە لە
اتوویەکی دوور یان نزیکدا رووداوی گەورە دروستبکات. ئەو شتە
تییە لەوەی کە مۆدێرنیتێی فەرەنسی سەرگەرمی دروستکردنی
وداوێکە لەنێو ئیسلامدا. ڕووداوێک کە رەنگە وەک لەدیکبوونی
لامێکی دی لەنێو ئیسلامدا لەقەڵەمبدرێت. ڕووداوێک کە رەنگە
داهاتوودا ببێتە مامانی مۆدێرنیزاسیۆنی ئیسلام، نەک هەر
ەرنسادا بەڵکو لەنێو جیهانی عەرەبۆ-موسوڵمانیشدا. مۆدێرنیتێی
ەنسی چەکدەداتە دەست موسوڵمانەکان بۆ ئەوەی بتوانن جەنگی
گرفتانە بکەن کە دێنە سەر رێگای مۆدێرنیزەکردنی ئاینەکەیان.

### ٢.بیناکردنی ئیسلامی فەرەنسی.

ەرەدا مەسەلەیەکی گرنگ جێگای تێبینی و نرخاندنە. ئەوەی
ەرەنسادا ڕوودەدات، شۆرشی مولحیدەکان نییە دژی ئیسلام،
رشی کافرەکان نییە دژی ئیمانداران، ئەو شۆرشە لە ناوەوەی
گەی ئیسلامیی خۆیدایە و شۆرشگێرەکان خودی موسوڵمانان
یانن. ئەو موسوڵمانانە، لەرێگای گوتارو پراکتیکەوە، سەرگەرمی

بیناکردنی مۆدێلێکی دیکەن لە ئیسلام، مۆدێلێک کە رەنگە لە داهاتوو
مەککەو مەدینە ناچاربکات بە قبوڵکردنی. گەر جاری پێشوو ل
عەرەبی سعودیدا ئیسلام بیناکرابێت، ئەوا ئەمجارەیان لەوڵات
رۆشنگەرییدا بینادەکرێت.

من لێرەوە هەوڵدەدەم چەند نموونەیەک لەو گۆرانکارییانەی ک
فۆرمی دیکەی ئیسلام پێشنیازدەکەن، بخەمە روو. ئەو نموونانە ب
خۆیان زمانی تایبەتیان هەیەو دەتوانن بدوێن. چەند نموونەیەک ل
پراکتیک و لەو گوتارانەی کە ئێستا لە پانتاییە گشتییەکاندا خۆیا
مانیفێست دەکەن، رەنگە یارمەتی ئەوەمان بدەن باشتر تێبگەین.

لێرە لەفەرەنسا، مرۆڤەکان لە سەردەمی ئازادیی جەستەدا دەژیر
لێرە جەستە بە هەزاران حەرام و پیرۆزییەوە نەبەستراوەتەو
(جارێکی دیکە دووبارەیدەکەمەوە کە ئێمە وەک توێژەر شەرعیەت
ئەوە بەخۆمان نادەین کە قسە لە باش و خراپ بکەین، ئێمە تەنه
تەحلیلدەکەین). خۆشەویستیی نێوان کورو کچێک خۆی لە نووسین
نامەو ئیمەیلەکاندا کورتناکاتەوە. مارەبرین لە کەنیسە
شارەوانییەکاندا تەنها رێگای مومارەسەکردنی سێکس نییە. ل
فەرەنسادا، ژیانی پێش مارەبرینی دووکەس، وەک دۆخێکی سروشتی
تەماشادەکرێت. کوروکچەکان لەخۆیان دەپرسن: چۆن دەکرێت لەگە
کەسێکدا خێزان دروسبکەیت بەبێ یەکترناسین؟ ئەم ئەزموونە تادێ
پەرەدەسەنێت چونکە جیابوونەوەی پاش مارەبرین ئاسان نییە
دنیایەک هاتوچۆی بەدواوەیە.

ئێستا ئێمە لە پراکتیکی کورو کچە موسوڵمانەکان رادەمێنین
دەیخەینە بەردەم ئیمتیحانی سەردەمی ئازادیی جەستەوە، تا ببینیر
چۆن ئەو ئیماندارانە فۆرمێکی دیکەی ئیسلام بینادەکەن، فۆرمێک ک
هەم موسوڵمان بێت و هەم توانای چوونە نێو سەردەمی ئازادیی
سێکسییشی هەبێت.

سەرەتای بیناکردنی ئەو فۆرمە نوێیە، لای موسوڵمانانی فەرەنسا، دەستکارییکردنی دەزگای مارەبرینی خێزانەوە دەستپێدەکات. لەنێو ادیسیۆنی ئیسلامییدا، پراکتیککردنی سێکس کاتێ دروستە کە بە ارەبرینێکی شەرعییدا تێپەڕێت و مەبەست پێی دروستکردنی ێزانێکی جێگیربێت. نابێت وەک ئەزموونێک بۆ گوزەر تەماشابکرێت. ەوە کورو کچە مولتەزیمە فەرەنسییەکان تەنها لەدروستکردنی ێزاندا مافی پراکتیککردنی سێکسیان هەیە. بەڵام موسوڵمانانی ەرەنسا دێن و دەستکاریی ئەم پێناسەیە دەکەن و سەرلەنوێ فسیرێکی دیکە و پراکتیکێکی دیکە بەئیسلام دەبەخشن. ئێمە لێرەدا سە لەسەر ئەو کورو کچانە ناکەین کە موسوڵمانن، بەڵام سەرپۆش ریشیان نییە. ئێمە راستەوخۆ قسە لەسەر ریش و سەرپۆشدارەکان ەکەین.

عائیشە کچێکی موسوڵمانی تەواو موحەجەبەیە؛ یەکێکە لەو کچانەی ە پابەندەو خۆی بەهەڵگری پەیامی خوداوەند دەزانێت و پێیوایە کە و لێرەیە بۆ ئەوەی هەموو ژیانی بە دەعوە بۆ بەهەشت ببەخشێت. و بەمشێوەیە گوفتوگۆی لەگەڵداکردین:

(-ئایا تۆ دەتوانیت شوو بەکەسێک بکەیت بەبێ ئاشناییەکی پێشینە گەڵ ئەو کەسەدا؟

- بەڵێ. مەبەستم لە مارەبرین ئەوەنییە کە خێزانی لەگەڵدا روستبکەم. کە دەڵێم مارەبرین، تەنها مارەبرینی ئایینیم مەبەستە. ەنها بۆ ساڵێک یان دوو ساڵ، تەنها بۆ ئەوەی یەکتر بناسین. نموونە وەک براکەم کە ئێستا لەگەڵ کچێکی موسوڵماندایە بەبێ ێزان.

- تێدەگەم. واتە لەبری ئەوەی ساڵێک لەگەڵ کورێکدا بیت تا ناسیت، وەکئەوەی لەفەرەنسادا هەیە، تۆ دەڕۆیتە خزمەت ئیمامێک ئەوەی فاتیحەکە بخوێنێت و ئیتر لەگەڵ ئەو کورەدا پێکەوە دەبن.

گەر هەموو شتێک بەباشیی بەرێوەچوو ئەوە خێزان دروستدەکەن، گەرنا، هەرکەس بەرێی خۆی، وایە؟

- بەڵێ. گەر هەموو شتێ باش نەروات بەرێوە، بای بای، هەرکەس بۆ ماڵی خۆی.

- بەلام لەو ساڵەدا منداڵ ناکەن؟

-نا،نا. منداڵی چی!

- واتە تەنها فەترەی تاقیکردنەوەیە؟

-بەڵێ.

-ئایا ئەوە بووە بە پراکتیکێکی ئاسایی لای موسوڵمانانی فەرەنسا؟

-بەڵێ، کەم کەس هەیە وانەکات.

-لەم شوکردنەدا ئێوە لەماڵێکدا پێکەوە ناژین؟

-نەخێر، دەبێت پێش هەمووشتێک من بیناسم.

-لەو ساڵەدا بەیەکەوە دەرۆنە دەرەوە؟

-ئەیچۆن.

-بەیەکەوە دەخەون، خۆشەویستیی دەکەن پێکەوە؟

- شەرعیەتی ئەوەمان هەیە کە خۆشەویستیی پێکەوە بکەین. بەلام دواتر دەکەوێتەوە سەرخۆمان.

-بەلام تۆ، ئایا تۆ ئامادەیت جەستەی خۆت بخەیتە بەردەست کورێک کە هێشتا دڵنیانیت خێزانی لەگەڵدا دروستدەکەیت یان نا؟

- ئەی بۆنا؟

-تۆ چۆن گەیشتی بەم قەناعەتە؟

-ئاینەکەمان رێگامان پێدەدات.

-بەلام لەئایندا، مارەبرین و خێزان پێکەوە لکاون.

-بەڵێ، بەلام تۆ دەبێت ئاین و ترادیسیۆن لەیەک جودابکەیتەوە. وەختی خۆی هەردووکیانیان تێکەڵکردبوو. دایکم دەڵێت وەختی خۆی ژنان بەبێ ئەوەی مێردەکانیان بناسن شویان دەکردو تەنها یەکەم

شەوی پێکەوە خەوتن یەکتریان دەبینی. شتی وانابێت دووبارە بێتەوە. ئاخر چۆن دەتوانین خێزان لەگەڵ کەسێکدا دروستبکەین بەبێ ناسینی، بەبێ ئەوەی بزانین چۆن بیردەکاتەوە، چۆن رەفتاردەکات؟).

لێرەدا ئاین دژی ترادیسیۆن و کولتوری عەرەبی تەعبئیەکراوە. ئەو فۆرمە بیناکراوەی ئیسلام کە بێگومان لەژێر کارایی ژیانی فەرەنسیدایە بەربەستێک نییە، بەپێچەوانەوە یارمەتیدەرێکە بۆ ئەو موسوڵمانانەی کە لەجەنگدان دژ بە ترادیسیۆن و کولتوری عەرەبی، کە هەموو پەیوەندیەکی سێکسیی لەدەرەوەی دەزگای خێزان قەدەغەدەکات.

ئەم شێوە نوێیەی شوکردن رێگادەدات بەو کچە سەرپۆشبەسەرە ئیماندارانە تاوەکو بەباشیی پیاوان بناسن و پاشان بەئارەزووی خۆیان هەڵبژێرن. هەروەها رێگای ئەوەیان پێدەدات، بە شێوەیەکی شەرعیی، مومارەسەی خۆشەویستیی بکەن و ماوەیەکی باش لەگەڵ پیاوێکدابن. گەر هەموو شتێک بەدڵی ئەوان بوو بێگومان بریاری مانەوەو بەرەسمیی ناساندنی مارەبرینەکەیان دەدەن، گەرنا وەک عائیشە دەڵێت: بای بای.

ئەم دیاردەیە تەنانەت زانایانی ئیسلامی دونیای عەرەبۆ-موسوڵمانیشی هێناوەتە دەنگ. ئەو زانایانە بێگومان چەندین هەڵوێستی جودایان هەیەو یەکرانین لەسەر ئەو مەسەلەیە. بەشێک لەو زانایانە پێیانوایە کە ئەو مارەبرینە هەرلەبناغەوە حەرامەو (خوا) رەزامەندیی خۆی لەسەر نادات و موسوڵمانان دەبێت (خوا) هەڵبژێرن نەک نەفسی خۆیان. بەڵام بەشێکی دیکە لە زانایان پێیانوایە کە ئەو فۆرمە بیناکراوەی موسوڵمانانی فەرەنسا هیچ دژایەتییەکی لەگەڵ ئیسلامدا نییە و (خوا) رەزامەندیی لەسەر هەیە. بەڵام دەڵێن ئەو فۆرمە تەنها لە ئەوروپادا جائیزەو نابێت لەوڵاتانی ئیسلامدا رێگای

پێبدرێت. ئەم موقارەبەیە زیاتر لەلایەن زانای هەرەبەناوبانگی یەمەنی ( عەبدول مەجید زەنەدانی)یەوە پیشتگیریی لێدەکرێت.
هێنانە دەنگی ئەم زانایانە و دابەشکردنیان بەسەر دوو بەرەدا، خۆی بۆخۆی سەرکەوتنێکە بۆ ئەو فۆرمە فەرەنسییە ئیسلامییەی شوکردن. بەدیویێکیتردا دەتوانین دروستکردنی ئەو هەرایە یەکێکە لا هاوارەکانی ئیسلامێکی مۆدێرنیزەکراوی فەرەنسی بەرووی دونیای عەرەبۆ-موسوڵمانی جێگیردا.
با نموونەیەکەی دیکە بێنینەوە.
هەرلە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە تا ئەمرۆ، لەنێو ترادیسیۆنی ئیسلامییدا، پیاوانی موسوڵمان مافی ئەوەیان هەبووە کە لەگەڵ ژنە مەسیحیی و جولەکەکاندا خێزان دروستبکەن. بەڵام ژنانی موسوڵمان بەهیچ شێوەیەک مافی ئەوەیان نەبووە لەگەڵ پیاوانی مەسیحیی و جولەکەدا خێزان دروستبکەن. ئەم دۆخە زیاتر وەک نۆرمێکی لێهاتووە. بەڵام لێرە لە فەرەنساداو، لە ماوەی ساڵ و نیوێک لە توێژینەوەی سۆسیۆلۆژیمان، تێبینی ئەوەمانکرد کە چەندین ئافرەتی موسوڵمانی نوێژکەری ئیماندار لەگەڵ فەرەنسییە (ناموسوڵمانەکاندا) خێزان دروستدەکەن، بەبێ ئەوەی هەست بەوە بکەن کە بستێک لەئیسلام دورکەوتوونەتەوە. (بێگومان ئەوە ئیشی ئێمە نییە بڵێین ئەو ژنانە لە ئیسلام تێنەگەیشتوون و ئیسلام بەوشێوەیە نییە و بەمشێوەیەیە و ئەوانە لەئیسلام لایانداوە. ئەوەی بۆ ئێمە وەک توێژەری سۆسیۆلۆژیی گرنگە، تێگەشتنە لە پراکتیکی ئەو کەسانەی کە خۆیان بە موسوڵمان دەزانن، نەک بەشتێکی دیکەو خۆیان بەهەڵگری شوناسی ئیسلامیی دەزانن نەک شوناسێکی دیکە. ئەوان لەسەر هەقن یان نا، بێگومان وەڵامی ئەو پرسیارە کاری ئێمە نییە).
ئەو ژنانە هەڵگری تەفسیرێکی دیکەی ئیسلامن. ئەوان پێیانوایە کاتێک کە ئیسلام رێگای نەدەدا بەوەی کە ژنی موسوڵمان لەگەڵ

یاوی ناموسوڵماندا خێزان دروستبکات، لەبەرئەوەبوو کە یەکسانیی
ەنێوان ژن و پیاودا نەبوو. پیاو دەیتوانی تەنانەت ژنەکانیشی
فرۆشێت، پیاو مافی ئەوەی هەبوو ژنەکانی بکوژێت، دەیتوانی ئاینی
خۆی فەرزبکات بەسەر ژنەکانیدا. بەڵام ئەمرۆ ئەو دۆخە تەواو
ۆراوەو دەوڵەت یەکسانیی لەنێوان ژن و پیاواندا دەستەبەرکردووەو
ەس مافی ئەوەی نییە خۆی فەرزبکات بەسەر ئەوی دیکەداو
ەکسانیی تەنانەت یەکێکە لە پایەکانی جمهوریەت. لێرەوە، ئەوان
ەڵێن، هیچ بیانوویەک نییە بۆ ئەوەی شوو بەو کەسە نەکەین کە
ۆشماندەوێت. ئەوان دەڵێن: ئامانجی خوا پاراستنی ژنان بوو لە
ەبرو زەنگی پیاوان، ئەمرۆ جمهوریەت ئەو مافەی
ەستەبەرکردووەو ئیتر کارکردن بە یاسای قەدەغەکردنی شووکردن
، ناموسوڵمان دەبێت رابگیرێت!
ئەم کردەیەش روویەکی دیکەی ئیسلامی فەرەنسی مۆدێرنیزەکراوە.
ەو موسوڵمانە خواناسانە، نایانەوێت بەهیچشێوەیەک دەستکاریی
یەتەکان و دۆگمەکان و بنەماکانی ئیسلام بکەن. ئەوان هیچ
رمانێکیان لەسەر دۆگمەکان نییە. ئەوان تەنها دێن وپەیوەندیی
ۆیان بەو ئایەت و بنەما و دۆگمانەوە بینادەکەنەوە. ئەوان رەخنە لە
انسیپەکانی ئیسلام ناگرن و ئیسلام وێراننناکەن، هەموو ئەوەی
وان دەیکەن تەنها کلیککردنە لەسەر رۆحی ئیسلام.

### ۳.کۆتایی.

ئەم کلیککرندە نوێیە لەسەر ئیسلام، یاخود بەگوزارشتی ئۆلیڤەر روا
ەم بەرۆژئاواییکردنەی ئیسلام، کارایی خۆی تەنانەت
سەرفۆندامۆنتالیستێکی وەک تاریق رەمەزانیشەوە بەجێدەهێڵێت.
ریق رەمەزان، کورەزای حەسەن بەننا، لەلایەن میدیای فەرەنسییەوە
ک نوێنەری فیکری فۆندامۆنتالیسمی ئیسلامیست لە ئەوروپا

ناسێنراوە. ئەو پیاوە کاریزماتیکەی جەماوەرداره، بەردەوام، لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانی فەرەنسا وسویسرا، دەڵێت کە هیچ دژایەتییەک لەنێوان ئیسلام و لایسیتێدا(عەلمانیەت: بەهەڵە تەرجەمەکراوەتە سەر زمانی عەرەبی) نییەو هەردووکیان دەتوانن پێکەوە بژین و ئیسلام دەتوانێت لایسیتێ قبوڵبکات. ئەم گوتارە لەنێو دونیای عەرەبۆ-موسوڵماندا وەک کوفر لەقەڵەمدەدرێت و خاوەنەکەشی وەک کافر. بەڵام موسوڵمانی فەرەنسا(جیا لە هەندێک ئیسلامیست) وەک ئیمامێک لە رەمەزان دەروانن.

# سەرچاوەکان

[1] Jaques Derrida, Jürgen Habermas, *le concept du 11 Septembre*, Galilée, 2004.
[2] Alain Touraine, *Un nouveau paradigme*, Fayard, 2005. p.23.
[3] Alain Touraine, *Un nouveau paradigme*, Fayard, 2005. p. 33.
[4] René Rémond, *Du mur de Berlin aux tours de New York*, Bayard, 2002. p.32.
[5] Francis Fukuyama, *La Fin de l'histoire et le dernier homme,* Flammarion, 1992.
[6] Claude Liauzu, *Empire du mal contre Grand satan*, Armand Colin, 2005. p.14.
[7] Jonathan Randal, *Oussama. La fabrication d'un terroriste*, Albin Michel, 2004.
[8] Jacques Baud, *Encyclopédie des terrorismes et violence politique*, Lavauzelle, 2003, p.36
[9] Alain Joxe, *L'Empire du chaos*, La Découverte, 2002.
[10] Abdelwahab Meddeb, *La maladie de l'islam*, Seuil, 2002, p.75.
[11] Manuel Cstells, *La société en réseaux. L'ère de l'information*, Fayard, 1998.
[12] Roger Silverstone, *La médiatisation de la catastrophe*, les dossier de l'audiovisuel, 2004, p.60.
[13] Jaques Derrida, Jürgen Habermas, *le concept du 11 Septembre*, Galilée, 2004. p.219.
[14] Mouhammed Arkon, *De Manhattann à Bagdad*, Desclée de Bouwer, 2003, p.41.
[15] Claude Liauzu, *Empire du mal contre Grand satan*, Armand Colin, 2005. p.23.
[16] Olfa Lamloum, *Les médias en guerre*, Sindbad Actes Sud, 2003.
[17] Claude Liauzu, *Empire du mal contre Grand satan*, Armand Colin, 2005. p.25.
[18] Marie-Louise Mallet, *La démocratie à venir : autour de Jacques Derrida*, Galilée, 2004.
[19] Françoise Gaillard, *La modernité en questions : de Richard Rorty à Jürgen Habermas*, Cerf, 1998.
[20] Touraine, Alain, *Crituque de la modernité*, Fayard, 1992.

[21] Castells Manuel, *La société en réseaux*, Fayard, 1998.
[22] Henry Gérard-Marie, *100 questions sur la mondialisation*, Studyrama, 2003.
[23] Guy Laforest et Philippe Lara, *Charles Taylor et l'interprétation de l'identité moderne*, Cerf, 1998.
[24] Alain Touraine, *Un nouveau paradigme*, Fayard, 2005.
[25] Marcel Gauchet, *La démocratie de notre temps*, Genève, 2003.
[26] Samuel Huntigton, *Le Choc des civilisations*, Odile Jacob, p. 15-16.
[27] Lucien Febvre, *Pour une histoire à part entière*, Ehess, 1962, p.481.
[28] Claude Liauzu, *Empire du mal contre Grand satan*, Armand Colin, 2005. p.45.
[29] Henri Berr, Avant-propos Civilisation. In. *Empire du mal contre Grand satan.* Cit. p 46.
[30] Edward Tylor, *La civilisation primitve,* C. Reinwald, 1876, cité in dictionnaire de Sociologie, Seuil.
[31] Kaufmann, Jean-Claude, *L'invention de soi : une théorie de l'identité,* Armand Colin, 2004.
[32] Samuel Huntigton, *Le Choc des civilisations*, Odile Jacob, p. 22.
[33] Marc Crépon, *L'imposture du choc des civilisations*, Pleins Feux, 2002, p.74.
[34] Olivier Roy, *La laïcité face à l'islam,* Editions Stock, 2005.
[35] **Bruno** Latour, *La république dans un foulard*, Le Monde. 18.01.2004.
[36] Henri Pena-Ruiz, *Qu'est ce que la laïcité* ? Gallimard, 2003.
[37] Olivier Roy, *L'islam mondialisé*, Editions du Seuil, 2002, p.13.

# تابلۆی بابەتەکان